# لەتۆپخانەوە بۆ عەرعەر

## فەرەج ؛ ئەو ئەنفالکراوەی دوای گوللەبارانکردنی لەگۆڕە بەکۆمەڵەکانەوە گەیشتە واشنتۆن

عارف قوربانی

کوردستان – کەرکوک
2004

**ناوی کتێب: لەتۆپخانەوە بۆ عەرعەر**

**ناوی نووسەر: عارف قوربانی**

چاپی یەکەم

**پیتچنین: ئیدریس حاجی سەعید**

**نەخشەساز: شۆڕش ئەحمەد**

**چاپخانە: چاپخانەو ئۆفسێتی** تیشک

**تیراژ:** (1000)

ژمارەی سپاردن ژمارە (    )ی ساڵی ٢٠٠٤ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

لە چاپکراوەکانی دەزگای هەواڵ

## پێشکەشە :

## بە ( عەبدوڵڵا خەرابەیی )

کە هاوڵاتیەکی گوندی خەرابەی دەشتی کۆیە بوو لە ئەنفالی چواردا کاتێك هەزاران ژن‌و منالی ناوچەکەیان دەستگیرکرد.. (عەبدوڵڵا) لەناو حەشارگەیەکدا خۆی حەشاردابوو نەکەوتبووە دەستی سوپا، لە حەشارگەکەوە چاوی لێبوو کە دوو سەرباز لەناو قامیشەلانێکدا کچێکی کورد راودەنێن‌و دەیانەوێ پەلاماری بدەن، سەربازەکان بەزۆر جلەکانی لەبەردا دەدڕێنن.. ئەم دیمەنە وا لە عەبدوڵڵا خەرابەیی دەکات چاو لەمەرگی خۆی بپۆشێ‌و لەحەشارگەکەی دێتە دەرەوەو هەردوو سەربازەکە دەکووژێ.. لەدەنگی تەقەکان هێزەکانی تری ناوچەکە بەئاگا دێن‌و پەلاماری ئەو شوێنە دەدەنەوە، شەڕ لەنێوان سوپای ئەنفالکەرو عەبدوڵڵادا دروست دەبێت کە هێزی پشتگیری بوو.. شەڕ دەکات‌و چەند سەربازێکی تریش دەکوژێ، دوای ئەوەی فیشەکی پێنامێنێت دەستگیری دەکەن‌و (بارق عەبدوڵڵا) سواری کۆپتەرەکەی خۆی دەکات‌و لەبەرزایی ئاسمانەوە بەریدەداتە خوارەوەو شەهید دەبێت.

# پێشەکی

زۆر زۆربوون ژمارەی ئەوانەی بەر شاڵاوی بەدناوی(ئەنفال) کەوتن..
زۆرن ژمارەی ئەوانەی پریشکی ئاگری ئەنفالیان بەرکەوت و زۆریشن ئەوانەی ئاگایان لە کارەساتی ئەنفال هەیە.. بەشێکی زۆریش شایەتحاڵمان هەیە کە وردەکاری دەربارەی چۆنیەتی کۆکردنەوەی گوند نشینەکان و گرتن و گواستنەوەیان لەناوچەکانی خۆیانەوە بۆ سەربازگەکان و دواجار بۆ کەمپەکانی دەست بەسەراگرتن بۆ دەگێڕنەوە.. تا ئەوانەی خوشک و براو ئازیزانیان بەبەر چاویانەوە دەست و چاویان بەسترایەوە و خرانە ناوسەیارەی(موقەپەتەوە) و بەرەو شوێنی نادیاربران.. تا ئێرە شایەتگەلێکی زۆرمان هەیە گەرچی قسەو باسێکی کەمیان نووسراونەتەوە و بوونە بە بەشێک لە مێژووی ئەنفال، بەڵام ژمارەی ئەوانە زۆر کەمن کە شایەتحاڵی گوللەباران و چۆنیەتی زیندە بەچاڵکردن و لە گۆڕی بەکۆمەڵدا کوشتنی ئازیزانمان بێت..زۆر کەم و دەگمەنن، ژمارەیان لە پەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکاتو تەنها(5)شایەتحاڵی زیندوومان هەن کە خۆیان ئەنفالکراون تا دیار

چاڵەکانی مەرگ هاوسەفەری ئەنفالەکانمان بوون و خۆشیان ١٠٠رترونەتە بەر لوولەی چەکی بی بەزەییانەی جەلادەکانی بەعس و بە ریدەوت دوای برینـدار بونیـان و خـۆ دزینـەوەیان لـە گـۆڕە بەکۆمەڵەکانـەوە گەڕانـەوە. تـا ئـەو تراژیـدیاو دیمەنـە سـاماناکانەی نێـو گـۆڕە بەکۆمەڵـەکان بگێڕنـەوە و ئـەو بۆشـاییە گەورەیـەی بـە مێـژووکردنی ئـەنفال پـڕ بکەنـەوە کـە جگـە لـەوان کەسـی تـر بـەو نهێنیانـەی نەزانئوە. (فەرەج)یەکێکە لەو (٥) کوردە ئەنفالکراوەی دوای گوللەباران کردن، خوا زیندووی کردەوە و گەڕایەوە نیشتمان تا ئەم بەسەرهات و مەرگەساتە بۆ مێژوو و بۆ ئێستا و بۆ نەوەکانی داهاتوو بگێڕێتەوە.

***کاك فەرەج من زۆر دەمێکە بە ئاواتی ئەوەوە بووم کە چیرۆکی ژیانی تۆ و هاورێکانت ئەو چوار کەسەی تر کە وەك تۆ لە گوللەبارانکردنی ئەنفال رزگاریان بوو بینووسمەوە، وا رێکەوت کە تۆ شەرەفی کەسی یەکەمت بەرکەوت..**

-باشە، بەخێر بێی بەلام وەك وتم بەمەرجێ رەچاوی ئەو تایبەتمەندیەی وەزعی من بکەی.

***بە چاوان رازیم..! یەکەم پرسیاریشم لێرەوە دەست پێدەکەم کە ناوی سیانی و سالّ و شوێنی لە دایك بونت بلّێی..!؟**

-ناوم فەرەج محەمەد عەزیزە لەدایك بووی سالّی ١٩٥٠ گوندی تۆپخانەی سەربە ناحیەی قادرکەرەمم.

***هەر بە ئەسلّ خەلّکی تۆپخانەبوون یان لە شوێنی ترەوە چوونەتە ئەوێ..؟**

-وەلاهی نازانم بەلام گۆری باوك و باپیرم لەوێیە ئیتر نازانم پێشتر لەکوێ بوونە..

***تۆپخانە دێیەکی چەند مالّی بوو..؟**

-١٠ بۆ ١٢ مالّ.

***قوتابخانەی تیابوو یان حوجرەی ئاینی ..؟**

-نەخێر..

***تۆ خوێندەواریت هەیە..؟**

-نەمخوێندوە و خوێندەواریم نەبووە بەلام ئێستا خەریکم فێری ئینگلیزی دەبم..!

***کاك فەرەج من دەمەوێ هەندێ بیرەوەریت بگێرمەوە بۆ سەردەمی منالّی و لەوێ وە دێنەوە بۆ سەردەمی ئەنفال.. حەز دەکەم لەخۆت بپرسم لەکوێ وە دەست پێبکەین..!؟**

-من نازانم لەکوێ وە دەست پێبکەم، تۆ چی ئەپرسی من بیزانم وەڵامت ئەدەمەوە و نەشیزانم خۆ نامکوژی..

***مەبەستم ئەوەیە بیرەوەریت لەکەیەوە دەست پێدەکات یاخود هەست دەکەیت چی شتێکت لە بیرماوە کە هەست بکەی شتی تری پێش ئەو تەمەنەت لەبیرنیە..!؟**

-هەروا دێتە بیرم منداڵ بووم ماڵمان لە تۆپخانە باری کرد بۆ (حەسەن پرچن)..

***نازانی ساڵەکەی کەی بوو یان گەر باسیان کردبێ ئەوکات تۆ چەند ساڵان بووی..!؟**

-وابزانم ساڵی ١٩٥٦ بوە..

***نازانی بۆچی بارتان کردووە لەکاتێکدا ئەڵێی گۆڕی باوکم و باپیرم لە تۆپخانەبوون..؟**

-من ئەوکاتەم بەوشێوەیە لەبیرنیە بزانم بۆچی بارمان کردوە.. بەڵام وابزانم بەهۆی ئەوەوە بووە کە بەشێکی زۆری خزمەکانمان لە(حەسەن پرچن)بووە.. هەرچەندە من هەر منداڵ بووم تەمەنم نۆ ساڵان بوو لەوێش بارمان کرد بۆ(قشلاخ کۆن)چونکە هەندێ ئاغای لێبوو لەسەر زەوی و زار ناکۆك بوین ئێمە لە ئاوایی بارمان کرد..

***لەماڵەوە چەند سەر خێزان بوون..؟**

-خێزانێکی زۆر بوین، باوکم سێ ژنی هێناوە، ئێمە(٦) خوشك و (٢) برا بوین بەڵام دوایی باوکم ئەمری خوای کرد دایکم شووی کردۆتەوە بە مامێکم (٤) برای تریشم هەبوو کە دایك برام بوون..

***گەرچی ئەوکات خەڵك بەگشتی هەژاربووە.. دێتە بیرت کە ئێوە گوزەرانتان چۆن بوو..؟**

-بەوخوایە برا نازانم بەلاّم ئەزانم مەعیشەتمان لەسەر مەڕداری و کشتوکاڵ کردن بوو زەوی و زارمان هەبوو گەنم و جۆمان لێ ئەکرد و مەڕداریش بووین..

***ساڵی ١٩٦٣ کە لای کورد بە ساڵی (بەعسیەکە) ناسراوە ئەوکات تۆ تەمەنت ١٣ ساڵان بووە، بێگومان بیرەوەری ئەوکاتەت باشتر لەیادە..!؟**

-ئائا، ئەوکاتە هەراش بووم..

***هەست ئەکەی چی رووی دا لە دێیەکەی ئێوە و ناوچەکەتان..!؟**

-ئەوکاتە تازە تاك و تەرا پێشمەرگە پەیابوو بوو بەلاّم ئێمە چونکە نزیك بوین لە لەیلانەوە کەمتر ئەهاتنە لای ئێمە.. هەروەها(حەرەس قەومی) یش هەبوو ئەوانیش ئەهاتن بەلاّم چونکە نزیك بوین لە لەیلانەوە ئەمانە زۆرتر ئەهاتن..ئەوکاتەی تالاّنیەکە دەستی پێکرد نازانم هۆی چی بوو وابزانم ئەیانوت(حکومەت گۆڕاوە) عەرەب پێ پەتی هاتن وەك رەوە کوللە لەگەڵ حەرەس قەومی و جەیش دا دایانە سەرناوچەکەدا، بەلاّم ئەوکاتە وەك ئەم دواییە نەبوو هەر لە ئاوایی دەرچویتایەتە ئەو هەردە و هەڵەتانە خۆت لە بەلاّ ئەپاراست.. ئێمە چوینە ئەو(جەوەڵە) تا دایانە سەر دێیەکەدا و رۆیشتن و کاتێ گەڕاینەوە ئاوایی سەیرمان کرد هەرچی هەیە تالاّنیان کردووە ئاگریان ناوەتە خانوو وماڵەکانیشەوە..مەڕ و مالاّتیان گشت بە تالاّن بردبوو یەك دوو (کەر) لە ئاوایی بوو کوشتبویان.. من ئەو کاتە(بەچکە ئاسکێکم هەبوو) کە هاتینەوە نەمابوو بردبویان بەقەدەر ماڵ و هەموو کەل و پەلەکانمان بۆ ئەو بەچکە ئاسکە پێم ناخۆشبوو.. ئیتر ئەو ساڵە ساڵێکی ناخۆشبوو ماڵی هەموو کورد فەرهود کرا و خانوی هەموو ماڵێکیان سوتان.. بەچەند مانگ دوای ئەوە ئەوسا هەرکەس خانووی دروست کردەوە..بەلاّم بە رەزالەت خەڵك فەقیر بوو.

***جگه له ئەنفال ئەوه دواجار بوو ماڵتان بسوتێ..!؟**

-نەوەڵا لە ساڵی ١٩٦٥ جارێکی تر جەیش دایە سەر دێیەکەدا سووتانیان..

***هەموو ناوچەکەیان سوتان یان هەر گوندەکەی ئێوه..؟**

-وابزانم هەر دێیەکەی ئێمەبوو پێشتر پێشمەرگە هاتبوونە ئەوێ لەبەر ئەوەبوو..

***کەی خێزانت پێکەوه ناوه و له ئەنفال دا چەند منالت هەبوو..!؟**

-ساڵی ١٩٦٧ ژنم هێناوه.. سێ چوار ساڵ منالمان نەبوو، یەکەم منالم له ساڵی ١٩٧١ بوو کچم بوو ناوی ( نەخشین)ه   دوا منالیشم ساڵی ١٩٨٧ بوو کوڕه و ناوی(کاروان)ه (٩) منالم هەبوو لەکاتی ئەنفال دا.

***سیستەمی ئەم وڵاتە وابوو لە ١٨ ساڵیدا دەبوو نێرینە بچێتە ریزی سەربازی.. کەی بووی بەسەرباز..؟**

-من سەربازیم نەکردووه..

***بەهۆی چیەوه..؟**

-هەر فیرار بووم..

***تاکەی**

-کە موالیدم هاتەوه بۆ سەربازی نەچومە پێشەوه فیرار بووم تا ساڵی (١٩٧٥) ئەوکاتە بە (عائدون) خەڵکیان تەسریح دەکرد منیش بەو شێوەیە رزگارم بوو له سەربازی..

***دوای شکستی شۆڕشی ئەیلول .. رژێم دەستی کرد بە راگوێزانی گوندێکی زۆری کوردستان چ له ناوچه سنوریەکان و چ له ناوچه نزیك بە عەرەب نشینەکان و لە ئۆردوگادا خەڵکەکەی نیشتەجێ کرد .. ئەم پرۆسەیە تا شەڕی عێراق –ئێران بەو شێوەیەبوو گوندەکەی ئێوەی بەرنەکەوت..!؟**

-نەخێر تا ساڵی ١٩٨٧ گوندەکەمان مایەوە..

***هیچ جارێکی تر پەلاماری سوپای عێراق نەکراوەتە سەرتان..!؟**

-هەر ئەو دووجارەی(٦٣و٦٥)سوتاو تالآن کراین. ئیتر تا ساڵی ١٩٨٠ لە مەترسی بەدوور بووین بەلآم لە ٨٠ بۆ ٨٧ چەند جارێك تەیارە لە دێیەکەی داوە یان تۆپ باران کراوین ماوەیەکیش بەرلەوەی دێیەکە بروخێنن هەموو هاتوچۆکردنێك قەدەغە بوو لەدێوە بۆشار و لە شاریشەوە بۆ دێیەکان بەشەو و بەرۆژ چاودێری رێگاو بانەکان ئەکرا کۆپتەر هەرچی بەدی بکردایە رەمی لێدەکرد ئەو ماوەیەش وەزعمان زۆر خراپ بوو..

***بەشێوەی رەسمی تەبلیغ کرابوون کە هاتو چۆکردن قەدەغەیە..؟**

-نارەوەڵآ..

***کێ تەبلیغی کردن..!؟**

-حکومەت..

***چۆن پێی راگەیاندن بە نووسراو یان هەر بە راگەیاندنی زارەکی..؟**

-چۆن یەعنی..!

***یەعنی کەسێك هات نووسراوێکی پێبێ و بڵێ ئەم نووسراوە حکومەت ناردویەتی کە ئاگادارتان بکەمەوە هاتووچۆکردن قەدەغەیە.. یان بەجۆرێکی تر تەبلیغ کران..!؟**

-نا، کەس نەهات پێمان بڵێ..!

***ئەی چۆن زانیتان کە ئیتر هاتوچۆکردن قەدەغەیە..کە کەس تەبلیغی نەکردبوون..!؟**

-ئێ کاکە تەبلیغ چیە، ئەو بەئاشکرا جاش و عەسکەری ئەهاتنە سەر رێگاوبانەکان رێگای هاتوچۆیان نادا ، کۆپتەر لەئاسمانەوە سەیارە و تەرەکتەر و بەخوا شوانیشی بدیایا رەمی لێ ئەکرد ئیتر تەبلیغ چیە لەوە زیاتر..

***ئەم حاڵەتە ماوەی چەنێ بەر لە روخانی گوندەکەتان بەردەوام بوو..؟**

-لە سێ ساڵ پێش ئەنفالەوە ئێمە ئاوا ژیاین تا بەو دەردە چوین

***ماوەی ئەو سێ ساڵە چۆن پێداویستیەکانی خۆتان دابین دەکرد بەتایبەتی ئەوانەی کە زەروری بوون و هەر دەبوو لەشاربەدەستی بێنن..!؟**

-بەدزییەوە و بەقاچاغ زۆرجاریش بەرتیلمان ئەدایە ئەو جاشانەی کە مەفرەزە بوون و لەسەر رێگاو بانەکانمان یان رەبایەیان هەبوو ئەوان ئەیانهێنا و بە پارەی زیاتر پێمانیان ئەفرۆشتەوە و خۆشمان بەبێ عاری خۆمان هەر هاتوچۆمان ئەکرد..

***ئەگەر کەسێکیان لە حاڵەتێکی وادا بگرتایە چیان لێدەکرد..!؟**

-ئەیانگرت..

***کەس هەبوو لەگوندەکەی ئێوە بەو شێوەیە گیرابێ..!؟**

-بەڵێ، من خۆم گیرام

***کەی..!؟**

-لە ساڵی ١٩٨٥ لە قشلاخ کۆنەوە چوم بۆ کەرکوك تەرەکتەرێکم پێبوو(ئاڵفم) بۆ حەیوان کڕیبوولە گەڕانەوە لە رێگە گرتمیان..

***ئەوانەی گرتیان چی بوون..!؟**

-مەفرەزەی تایبەت هەبوو بۆ ئەو کارانە پێك هاتبوو لە(عەسکەر، جاش ، ئەمن و ئیستخبارات)..

***سجنیان کردی..**

-هەر ئەو سەعاتەی گیرام بردمیانە(ئەمنی کەرامەی کەرکوك)دوو مانگ لەوێ هێشتمیانەوە تەعزیبمیان دا دوای دامیانە مەحکەمەی تایبەت،(٥) ساڵ حوکمی زیندانیان بەسەردا سەپاندم و تراکتۆرەکەشم(حجز)کرا..(١٥)مانگ لە ئەبو غرێب بووم دواتر

گواستمیانەوە بۆ موسڵ (١٦) مانگیش لەوێ بووم.. لێبوردنێك دەرچوو بەر ئەو لێبوردنە کەوتم و گەڕامەوە بۆ(قشلاخ)

***کاتێ گیرای.. هیچ کـەلو پـەلێکی قاچـاخ یـان چـەك و تەقەمـەنی، بڵاوکراوەی دژ بە بەعس، لە تراکتۆرەکەتدا نەبوو..!؟**

-نەخێر..

***تەنها لەسەر ئەوە گیرایت(ئالفت) پێبوو..؟**

-لەسـەر ئـەوە گرتمیـان کـە لـە دێـوە بـۆ شـار و لـە شـارەوە بـۆ لادێ ئەچم.. ئەوە لای ئەوان قەدەغە کرابوو..

***تۆ خۆت هۆکارەکەی بۆچی دەگەڕێنیتەوە..؟**

-ئەوان هەر کەس لە شارەوە هاتوچۆی دەشتی بکردایـە ئـەیان ووت ئـەوە یارمـەتی پێشـمەرگە ئـەدات بەوشـێوەیە مامەڵـەیان لەگـەڵمان دەکرد وە ئەوەش لە دەشتەوە بۆ شار بچوایە ئـەیانوت بـۆ(تـەنزیمات) ئەچێ.. ئەیانویست کورد لەناوبەرن ئیتر بەهەر جۆرێك بوایە

***دوای ئەو ماوە زۆرەی زیندانی بووی کە گەڕایتەوە گوندەکەت و ناوچـە ئازادەکانی ژێر دەسەڵاتی(پێشـمەرگە) چـۆن ئـەو دوو جیاوازیـەت بـەراورد ئەکرد..؟**

-کە بەربووم و چومەوە وەزع خراپتر بوو کۆمەڵێ دێهاتی ناوچـەکە روخێنـرابوون و سوتێنرابوون.. چەنـدین جار هەلیکۆپتـەر خـەڵکی لـە دێهاتەکان کوشتبوو سەیارەی سوتاندبوو.. خەڵك زۆر لـە رەزالەتـدابوو دنیا هەمووی مەترسی بوو..ماوەیەکی زۆر کەمی پێچوو تەیارە دای لە دێیەکەمان خێزانەکەم بریندار بوو بە پارچەی بۆردومـانی تـەیارەکان و دوای گوندەکـەمانیان روخـان خـەڵك پەرتـەوازە بـوو.. سـەرمان لێ شێوابوو ئەوەی خزمێ کەسێکی بوو لەشار یان لەناو حکومـەت جـوابی بۆ ئەنارد ئەی ووت بێن بۆ(موجەمەع) هەبوو ئەڕۆی بـەرەو شـارەکان

ئەچووە(موجەمەعات) بەڵام ئێمە نەچوین بۆ شار.. ئاوایی بوینە دوو بەشەوە بەشێکیان باریان کرد بۆ شار و بەشەکەی تری کە ماڵی ئێمە و سێ ماڵی تریش بووین بارمان کرد بۆ (تۆپخانە) ئەو گوندەی لێی لە دایك بووم و گۆڕی باو و باپیرمی لێبوو.. کە چوین مانگی چواری ۱۹۸۷ بوو بەهاربوو هەر زوو ماڵمان دروست کرد..

***دوای ئەوەی گوندەکەتان روخاو هەستان بەوەش دەکرد رۆژ لەدوای رۆژ رژێم پەلاماری توند تر دەکاتە سەر گوندەکان بۆچی لە نێوان (ئۆردوگا و تۆپخانە) دا تۆپخانەت هەڵبژارد..؟**

-ئەوان بە ئێمەیان نەوت خۆتان ئازادن کوێ هەڵدەبژێرن.. کە هاتن بۆ روخاندنی گوندەکەمان ئێمە لەترسا پێشتر چۆڵمان کردبوو کە گەڕاینەوە سەر ماڵە روخاوەکان خۆمان ئەو بڕیارەمان دا هەبوو ئۆردوگای پێ باشتر بوو هەبوو پێی خراپ بوو..

***تۆ خۆت چۆن بڕیاری ئەوەتدا نەچی بۆ ئۆردوگا..؟**

-من لەبەر ئەوەی تازە لە(سجن) بەرببوم ئەوەندەم رەزالەت بینیبوو ئەوەندە ئازار و ئەشکەنجەیان دابوون ئەگەر کونێکم لە ئاسمان شك ببردایە بۆی ئەچوم ناهاتمەوە بۆژێر دەستی حکومەت.. ئێ مەرداریش بوین ئەوەم بە باشتر زانی..

***پێت وابوو(تۆپخانە) ئەو شوێنەیە لەو مەترسیە رزگارت کات..؟**

-تۆپخانە لە قشلاخ کۆنەوە کە ئێمەی لێبوین (۱۰) سەعاتە رێ بەپێ دوور بوو، ئومێدمان وابوو کە حکومەت هەرناگاتە ئەوێ و ئەمانگوت رەنگە حکومەت هەر نەزانێ تۆپخانە لەکوێ وەیە..

***کەلە تۆپخانە نیشتەجێ بوون، مەترسی لەسەرتان کەمبووەوە..!؟**

-ئا، کەچوینە تۆپخانە وەك وتم دوور بوو لە قولایی گەرمیاندا بوو ماوەیەکی زۆر ئاگامان لە هیچ دەنگوباسێ نەما.. لەمەترسی سوپای

رژێم دوور کەوتینەوە، بەلأم دوای ماوەیەك وتی ئەوە پەیابوو کە حکومـەت هـەر رۆژەی پـەلاماری گونـدیٚ ئـەدات و هـەواڵ ئـەهات کـە فلأنە دێیان سوتان و تەیارە لە فلأنـە گونـد لـە سـەیارە و تەرەکتـەری داوە یاخود شوانی کوشتوە.. بۆیە هەر ترس و دڵڕاوکیٚ بەردەوام بوو..

***کیٚ ئەو هەوالأنەی بۆ ئەهێنان..؟**

-کام هەواڵ..!!!؟

***ئەوەی کە دەڵێـی هـەواڵ ئـەهات کـە فلأنـە دێـان سـوتان و کوژتـەر خەڵکی کوشت؟**

-هاتوچۆی شار قەدەغە بوو بەلأم لە نێوان دێهاتەکاندا هاتوچۆ هەر هـەبوو، پێشـمەرگەش بـەردەوام لەناوچـەکە بـوون و جەولـەیان دەکـرد..(تۆپخانـە) دوور بـوو لەشـارەوە وەك قشـلاخ کـۆن نـەبوو لـە بندەسـت لـەیلان بـوو پێشـمەرگە کـەم دەهـاتن.. بـەلأم لێـرە بـە پێچەوانەوە بوو، جەیش نەیئەوێرا بێتە ناوچەکە..

***کەواتە زیاتر بەهۆی جەولەی پێشمەرگەوە ئاگاتان لـەو روداوانـەبوو کـە رویان ئەدا..؟**

-بـەڵیٚ.. بەشێکیشی بـەهۆی هاتوچـۆی خـەڵك لـە دێیـەکانی تـرەوە بوو..

***هـیچ کـات لـە پێشـمەرگەکانتان ناپرسـی بۆچـی حکومـەت دێیـەکان دەروخێنیٚ..؟ یاخود لێیانتان ناپرسی ئەگەر سوپا بێـت و پـەلامارمان بـدات ئێوە چی دەکەن.. دەمانپارێزن..!!؟**

-پێشمەرگەیش هەروەك ئێمە ئەیزانی.. کاتێك ئەمانبیست کە سوپا گوندێکی سوتاندووە..

***من مەبەستم ئەوەبوو ئێوە ئەتانپرسی..!؟**

-نەمانئەپرسی، بەلام خۆمان ئەمانزانی کە ئەگەر سوپا بێتە سەرمان ئەوە پێشمەرگە لێی ئەدات و تێکی ئەشکێنێ..

***خۆیان هیچ کات ئەو قسەیەیان بۆ کردبوون، کە ئەگەر سوپا هات ئەوا تێکی ئەشکێنن؟**

-بەڵێ کردبویان و بەچاوی خۆشمان چەندین جار بینیمان کە سوپا پەلاماری گوندێکی ئەدا چۆن پێشمەرگە بەرگریان لە خەڵکی گوندەکە ئەکرد و خۆیان ئەدا بەکوشت لە پێناو پاراستنی خەڵکی گوندەکەدا..

***ووتت ئاگامان لەوە هەبوو کە رۆژ لەدوای رۆژ رژێم زیاتر پەلاماری چڕتر ئەکرد و گوندی زۆرتری دەسوتان.. بیرتان لەوە نەکردەوە بەدوای رێگا چارەدا بگەڕێن و خۆتان لەدەستی سوپا بپارێزن..!؟**

-ئێ کە بارمان کرد بۆ تۆپخانە بۆ ئەوەبوو خۆمان لەدەستی سوپا و جاش بپارێزین..!

***مەبەستم دوای چوتنانە بۆ(تۆپخانە) کە ئێوە لەوێ بوون ئاگاتان لە سووتانی گوندەکانی تر هەبوو..؟**

-ئەوکات بڕوامان وانەبوو حکومەت بگاتە (تۆپخانە) وامان ئەزانی هەر گوندەکانی نزیکە و شار و جادەکان ئەروخێنێ.. هەربۆیە زۆرێک لە خەڵکی ئەو گوندانەش کە ئەڕوخێنران خەڵکەکەی زۆر بەکەمی رێگای شار و ئۆردوگای ئەگرتە بەر هەمووی هەر بۆ گوندە دوورە دەستەکان ئەڕۆیی.. وامان ئەزانی حکومەت ناگاتە ئەوێ..!

***ئەی ئەوکاتەی کە پێشمەرگەی ناوچەکەتان هەمووی بانگ کران بۆ سەرکردایەتی روون بووەوە کە رژێمی بەعس ئەیەوێ پەلاماری ناوچەکانی سەرکردایەتی شۆڕشەکە بدات.. ئەوکاتەش هەستتان بەمەترسی گەورە نەکرد..!؟**

ئەوکاتە، ئەوەلا.. لەبەر ئەوەی چەند ساڵێکی زۆر بوو شەڕی نێوان کورد و عێراق هەر بەردەوام بوو زوو زوو سوپا پەلاماری هێزی پێشمەرگەی ئەدا.. ئەوکاتەش کە پێشمەرگەی ناوچەکەمان چوون بۆ سەرکردایەتی وەك زۆربەی جارەکانی تر ئێمە هەر وامان ئەزانی شەڕەکان وەك جاران وایە حکومەت پەلامارێك ئەدات و پێشمەرگە تێکی ئەشکێنێ و شەڕ کۆتایی دێت..! بەلام چوزانین ئەمجارە پێچەوانەی جارەکانی ترە و ئەمجارە سوپا پێشمەرگە تێك ئەشکێنێ و پەلاماری خەڵك ئەدات..

***پێشتر قەناعەتتان وابوو کە پەلاماری خەڵك نادات، تەنها پەلامارەکانی لە دژی پێشمەرگەیە..!؟**

-ئەی زوتر زۆرجار شەڕبوە، مەگەر خەڵك لەکاتی شەڕەکاندا پێوە بوبێت یان گیرابێ دوای بەردراوە.. کە کۆپتەر و تەیارەش چەند ساڵێك بوو هاتوچۆکردن و ئاگری سەیارەی بدیایە تەقەی دەکرد هەر وامان ئەزانی وا ئەزانێ پێشمەرگەیە بۆیە لێی ئەدات.. بەلام ئەمجارە وانەبوو هیچ جیاوازی نەکرد لە نێوان پێشمەرگە و منداڵی ناو بێشکەدا..

***کەی زانیتان کە مەترسیەکان زۆر لەوە گەورەترن کە ئێوە تەسەورتان دەکرد..!؟**

-ئەوکاتەی پێشمەرگەی ناوچەکە بانگ کران بۆ سەرەوە ئیتر هەواڵی ئەوە بلاو بۆوە کە حکومەت جەیشێکی زۆری کۆکردۆتەوە و پەلاماری ئەو ناوچانە ئەدات کە سەرکردایەتی(ی.ن.ك)ی لێیە.. دەنگ و باسی شەڕ بلاو بۆوە بەهۆی (ئیزگەی شۆڕشەوە) ئەمانزانی کەچی روودەدات چونکە رۆژانە هەواڵەکانی ئەخوێندەوە، ئێمەش تەنها شتێ کە وەزعەکەمان بۆ باس بکات ئەو(رادیۆیە)بوو.. بەهۆی ئەو

رادیۆیـەوە ئـەمانزانی کە رۆژ لـە دوای رۆژ پـەلاماری سوپا و جاش و کۆپتەر زیاتر دەبێت.. بەڕاستی خەمی گەورەمان بـوو کـە پێشمەرگە نەشـکێ چـونکە مانـەوەی خۆمـان لـە سـەرکەوتنی پێشـمەرگەدا بەدیـدەکرد.. رۆژانـەش کـە هـەواڵی شکسـتی پێشـمەرگەمان دەزانـی ئـەمانزانی کـە لـە مـەرگی خۆمـان نزیـك دەبینـەوە.. کـاتێ کـە پێشمەرگەکانیش بە شپرزەیی هاتنەوە و باسی شەڕەکانیان بۆمان کرد کەچـۆن حکومـەت دەسـتی لـە ژن و منـاڵ، تەنانـەت لـە ئـاژەڵیش نەپاراستوە و بە تۆپ و تەیارە لە خەڵکی داوە ، ئیتر بە جارێ زراومان چوو، هیچ ئومێدێکمان نـەما.. بـەڵام دڵی خۆمـان بـەوە ئەدایـەوە کـە حکومەت هەر پەلاماری ئەو ناوچانەی داوە وا بارەگای سەرکردایەتی لێبوە و کە ئێستا گرتویەتی ئیتر واز ئـەهێنێ و هـیچ لـە سنوورەکەی ئێمە ناکات.

***هەست ناکەیت ئەوە جۆرێك لە خۆ هەڵخەڵەتانن بوو..!؟**

-هـیچ چـارەیەکمان نـەبوو تروسـکەی ئومێـدیش نـەمابوو دەبـوو خۆمان ئومێدێك بۆ ژیانمان دروست بکەین..خۆهەڵخەڵەتانن نـەبوو، دڵخۆدانەوەیەکی ناچاری بوو..

***کە قەناعەتتان وابوو یاخود ئەو قەناعەتەتان لای خۆتان دروست کردبوو دڵی خۆتان پێی ئەدایەوە کە حکومەت تەنها پەلاماری ئەو ناوچـانە ئـەدات کە بارەگای پێشمەرگەی لێیە لەم کاتەدا چۆن لە پێشمەرگەکانتان ئـەڕوانی کە لەناوچەکەتان دا بوون..؟**

-دودڵ بـوین لەلایـەك ئـەمانووت بـەهۆی پێشـمەرگەوە ئەترسـین پـەلاماری ئێمـەش بـدات و ئەشترسـاین کـە ئەگـەر پێشمەرگە نەبێ جاش و جەیش چاومان دەرئەکەن ئەوەنـدە دێتە سەرمان..

***رونت نەكردەوە لەوكاتەدا هەڵوێستتان بەرانبەر بە پێشمەرگە چۆن بوو..!؟**

-ناڵێم دوودڵ بوین جارێك ئەترساین و لەترسا حەزمان ئەكرد پێشمەرگە لەلامان بێ تا بمانپارێزن و جارێكیش لەوە ئەترساین بەهۆی ئەوانەوە تیاپچین.. كە خۆیشیان لەو ژووورە هاتبونەوە و باسی دەربەدەری و پەتپەتی ئەو خەڵكەیان دەكرد لەوە ئەترساین ئێمەش وەك ئەو خەڵكەمان لێبێ ، بۆیە لە ترسی روحی خۆمان حەزمان ئەكرد كە پێشمەرگەكان بچنە ئەو هەڵەت و جەوەلأنە كە ئەگەر جەیش هات دوور لە ئێمە شەڕی بكەن، نەك بەهۆی ئەوانەوە ئێمەش لە ئاوایدا تیاچین..

***ماوەی چەنێ بەم حاڵەوە مانەوە تا ئەوكاتەی ئەنفال گەیشتە لاتان..؟**

-زۆری پێنەچوو.. هەر ماوەیەكی زۆر كەم دوای گەڕانەوەی پێشمەرگەكان هەواڵی ئەوەیان هاوردكە جەیش داوێتیە سەر قەراخدا و خەڵكی قەراخ و پێشمەرگەی ئەوێ بەشێكی خۆی گەیاندە گەرمیان ئیتر بەجارێ توقین و وتمان دیارە لەو ژوورەوە رایدەماڵێ و ئەو جەیشەی ناردویەتی بۆگیان سەركردایەتی بەسەر ئەم ناوچەیەدا ئەیگەڕێنێتەوە بۆ عەرەبستان وەك لافاو هەرچی بەركەوێ رایدەماڵێ و ئەیبات.. لەترسا لای خۆمەوە لێكم ئەدایەوە و ئەموت خۆزگە خەڵكی ئەم گوندانەی ناوچەی گەرمیان نەبوایەم، وام ئەزانی تەنها ئێمە بەو دەردە چوین چوزانین هەموو میللەتەكە بەدەردی ئێمە چووە..

***ئەی كاتێ پێشمەرگە و خەڵكی ناوچەی قەراخیش گەیشتنە ناوچەكانی ئێوە كە بێگومان ئەوەی دیویان بۆ ئێوەیان گێڕاوەتەوە ، ئەوكات چۆن بیرتان لەخۆ دەربازكردن نەكردەوە..!؟**

-ئێ کاکە ئەوکات کار لەکار ترازابوو ئەو خەڵکە کاتێ گەیشتە لای ئێمە سوپا بەدوایانەوە بوو پەلامارەکان وەك بازنە لە هەموو لایەکەوە هەمووڕۆژێ توند تر دەبوو.. دوای ئەوە ڕێگای دەربازبوون کوا مابوو.. ئەو لە هەموو لایەکەوە چوار دەوری ناوچەکەی تەنی بوو.. بەلام کورد ئەڵێ(مرۆڤ کەوتە ئاوەوە دەست بۆ کەفی سەر ئاوەکە ئەبات) بەراستی ئێمەش سەرباری ترس و دڵەڕاوکێ و ئەو هەموو قسەوباسانەی دەکران ، بەلام بڕوامان ناکرد بەو دەردە بچین کە تێی کەوتین.. چونکە پێشتر ئێمە دێمان سوتێنرابوو ماڵمان روخێنرابوو.. کە زۆر ئەترساین ترسەکەشمان هەر ئەوە بوو کە سوپا دێت و جارێکی تر ماڵمان کاول دەکات و دەربەدەر ئەبین..

***پێشتر باسی ئەوەت کرد کە پێشمەرگەکان گەڕانەوە لە شەڕەکانی سەرکردایەتی باسی ئەوەیان بۆ کردین کە رژێم بەهەموو جۆرە چەکێك پەلاماری خەڵکی داوە و تەنانەت جیاوازی لە نێوان مرۆڤو ئاژەڵیشدا نەکردووە..!؟**

-ئائا.. ئەوانەیان پێمان ووت بەلام ناڵێم ئەمانووت رەنگە بەهۆی ئەوەوە بوبێ کە بارەگای پێشمەرگەی لێبووە.

***کەواتە سەرباری مەترسیەکانی سوپا، هەستت بەوەنەکرد کە مەترسیەکە بەو شێوەیەیە کە ئەنفالی لێکەوتەوە..؟**

-نەخێر.. نەك من هیچ کەس نەبوو لەم کوردستانەدا رۆژێك لە رۆژان بە بیریدا هاتبێ کە میللەتەکەی بەو دەردە دەچێت..

***بۆ، چەند جاریتر هەر ماڵی خۆت روخێنراوە..!؟**

-هەزار جاریش ماڵمانی کاول کردبێ و خەڵکی دەربەدەر کردبێ ، کەس نەیئەزانی ئەم حکومەتە ئەوەندە زاڵمە..؟

***تۆ خۆت بێخەتا تەنها لەسەر چوونت بۆ کەرکوك و گەڕانەوەت چەنێ زیندانی کرای.. زاڵمی لەوەزیاتر چی..؟**

-کورە لە چاو ئەنفالەوە ئەوە کوا زوڵم بوو کە لەمن کرابوو.. ئەوەی لە ئەنفالدا کرا قەت نەبوە و قەتیش زوڵمی وا لە دنیادا دووبارە نابێتەوە..ئەوەی من لە ئەنفال دیم جورئەتی ئەوێ بیگێڕیتەوە.

***ئەوە وردە وردە دەچینە سەری ،ئەتوانی پێم بڵێی کەی پەلامارەکانی ئەنفال گەیشتە سەر ئەو گوندەی کە تۆی تیا ئەژیای، مەبەستم تۆپخانەیە..؟**

-وەڵاهی ئاوا نازانم بە تەواوی چی رۆژێك بوو.. بەلام کە پەلامارەکە بۆ سەر ناوچەی گەرمیان دەستی پێکرد ئێمە هەر ئەوکات ماڵ و مناڵمان خستە تەرەکتەرەوە بەرەو(نەحێکە) قادرکەرەم ناردیانمان..تەرەکتەرەکەمان پڕکرد لە ژن و مناڵ شەوبوو کەوتنە رێ بەرەو قادر کەرەم و لەترسا بێ لایت و بە تاریکی رێمان دەکرد لەپڕێ لای(تیلەکۆ)تەرەکتەرەکە هەلگەڕا و هەر خوا رەحمی پێیان کردبوو، ئەو هەموو ژن و مناڵە کەوتبونە ژێر عەرەبانەکەوە یەك دوانێ شەل و شیت بون بەلام کەس نەمردبوو.. ئەوان بەو حاڵەوە ئاخری گەیشتبوونە قادر کەرەم و ماڵ و مناڵی من چوبوونە ماڵ(حاجی حەسەن) لەناو(ناحێکە).

***لەکاتێکدا ئەو هەوالانەتان ئەزانی کە پێشتر چی بەسەر ئەو خێزانانەدا هاتوون کە بەرەو شارەکان دەچوون و ئەوەشتان ئەزانی کە سوپا دەوری ناوچەکەی ئێوەشی وەك بازنە تەوق کردوە چۆن وێراتان یاخود بڕیارتان دا ماڵ و مناڵەکانتان بەرەو رووی ئەو ئاگرە بنێرن و لە خۆتان جیایان بکەنەوە..؟**

-کە جەیش دەوری ناوچەکەی گرت و دێ بەدێ پەلاماریان ئەدا و ئەیان روخان و دەشت و دەر هەمووی جەیش و جاش گرتبووی و بەقەدەر نازانم بڵێم چەنێ هەلیکۆپتەریش بە ئاسمانەوە ئەسوڕانەوە و رەمیان ئەکرد.. ئیتر ئێمە هیچ دەروازەیەکمان نەمابوو هەموو ئەو خەڵکەش وەك یەك سەری لێ شێوابوو کەس نەبوو لەوی تر زیاتر ئەقڵی بە شتێکدا بشکێ گشت ئەو خەڵکە سەرگەردان بویمان.. وتیان مەلای مزگەوتەکان (قادر کەرەم) بە سەماعەی مزگەوتەکان بانگەوازی کردوە کە(عافواتە) و هەرکەس خۆی بێتەوە تەسلیم بێت ئەوە هیچی بۆ نابێت و ئەوی کە سوپا بیگرێت وەك (ئێرانی) مامەڵەی لەگەڵدا ئەکرێت.. ئیتر بۆیە بڕیارمان دا ماڵ و منداڵ بنێرینە (ناحێکە) وتمان خوا ئەکات ئەوان ناگیرێن خۆمان هەر چۆنێك بێت لەو(کەلۆەزانە خۆمان ئەشارینەوە) تا بزانین خوا چی ئەکات..

***کێ پێی ووتن مەلای مزگەوتەکانی قادر کەرەم بانگەوازی(عافواتی) خوێندوەتەوە..؟**

-ئەو خەڵکەی لەوێ وە ئەهات..!

***کەس هەبوو لەکاتی پەلامارەکاندا بتوانێ هاتوچۆبکات..!؟**

-وەك رۆژی حەشر وابوو هەموو ئەو خەڵکە بەیەکدا ئەهات و ئەچوو لەناو ئەو بازنەی سەربازیەی کە بەدەوری ناوچەکەدا بوون و رۆژ لەدوای رۆژ تەسك تر دەبۆوە هاتوچۆکردن هەبوو لەم دێ بۆ ئەو دێ لەم پەل بۆ ئەو پەل..

***کێ بوون ئەوانەی هاتووچۆیان ئەکرد..؟**

پێشـــــمەرگە و خـــــەڵكی دێیـــــەكان.. هێـــــزی پشـــــتگیری و لـە(ناحێكـە)یشـەوە ئـەو جاشـانەی خـزم و كەسـیان لـە لادێكـان بـوو نەهاتن بە هەواڵی كەس و كاریانەوە..

***رژێم چۆن رێگای بە جاشەكان ئەدا بێن بـۆ ئـەو ناوچـانەی كـە هـاتوو چۆكردن تیایدا( قەدەغەبوو)..؟**

-وەڵاهـی لـەوە ئەچـو حكومـەت خـۆی بیانێرێتـا بـێن دیعایـە بـڵاو بكەنـەوە، چـونكە كـە هەریـەكێ ئـەهات و قسـەی لەگـەڵ خزمـەكانی خۆیدا ئەكرد تـا بیانباتـەوە ئـەو خەڵكـەی هـەمووی ئـەتۆقان..ئـەیوت ئەوەنـدە جـەیش هـاتووە دار و بـەرد نـایگرێ و بـەخوا لـە كونـە تەیارەشدابن هەر ئەتانگرێ، خۆتان بێنەوە باشترە و عافواتەكە تـەنها سێ رۆژە..

***كەس هەبوو بەقسەی جاشەكان بڕواتەوە..؟**

-ئەروەڵا، ئەوەندە خەڵك بەقسەی جاش قوڕی كردە سەر خۆیداهەر مەپرسە..

***بۆ ئەوانەی كە چوونەوە بەرەو ناو رژێم و بە حیساب بـەپیری بانگـەوازی عافواتەكەوە چوون هەموو گیران و ئەنفالكران..!؟**

-وەڵا ئەویش دوو بەختی بوو هـەبوو رۆیشـتەوە لـە(ناحێكـە) لـەناو خـزم و ناسـیاودا خـۆی حەشـار دا و دوای رزگـاری بـوو هەیشـبوو كـە تەسلیم بۆوە قوڕ كرایە سەریا و هەتا ئێستاش بێسەر و شوێنە..

***تۆ وردتر بۆم باسكە.. ئەوانەی بەقسەی جاشەكان و بـەپیری عـافوات و بابڵێم بەپیری بانگەوازی مەلاكانی قادر كەرەمەوە چوون.. ئەوەی كە چـوە ماڵەكان و خۆی تەسلیم نەكرد رزگاری بوو.. وە ئەوەی كە تەسلیم بـووە وە ئەنفالكرا..!؟**

-نا،نا.. شەرت نیە هەموو ئەوانەی چوونە ناحێکە و ماڵان رزگاریان بووبێ ئەوەش تەسلیم بۆوە ئەنفالکرابێ..هەبوو لەماڵەکانیشدا دوای گیراو ئەنفالکرا.. هەبوو لە فەوجی جاشیشدا خۆی تەسلیم کردبوو خۆی ناونوس کردبوو بۆ جاشێتی و کەچی ئەویش هەر ئەنفالکرا..

***کەواتە ناتوانرێ لەیەك جیابکرێتەوە.. یاخود چوونەوە و نەچوونەوە ناکرێت بە پێوەر بۆ ئەنفالکردنیان..!؟**

-ئەی نالێم دوو بەختی بوو.. بەقسمەت بوو بەقسمەت.. ئەوەی قسمەتەکەی رۆیبووروۆیی و ئەوەش کە خوا لە چارەی نووسیبو بمێنێ ئەوە رزگاری بوو.. وەك من خۆ ئەنفالیش کرام و بەحیساب گوللەبارانیش کراین لە گۆڕی بەکۆمەڵدا ئەوەتا هاتیشمەوە..

***دوای ئەوەی ماڵ و منالەکانتان نارده قادر کەرەم خۆتان چیتان کرد..؟**

-هەردەکەی نێوان(قادرکەرەم و بنەکە) لەوێ کەلۆزی لێبوو لە ژێر هەندێ قامیشەلاندا خۆمان پەنادا و چاوەڕێی قەدەر بووین..

***چەند کەس ئەبوون..؟**

-من خۆم و(٥) برام ، برایەکی دایك و باوکم و(٤)دایك برام و (١٠)زەلامی تریش کە هەمووی ناسیاو و کەس و کاری یەکتری بووین..

***پێت وابوو تا چەند ئەتوانن لەوێ بمێننەوە.. یان بڕوات بەوە هەبوو کە لەناو قامیشەلاندا بتوانن خۆتان حەشاردەن تاکو پەلامارەکە کۆتایی دێت..؟**

-یاخوا کەس نەکەوێتە رۆژە رەشی واوە.. بێ نان و ئاو بێ جلو جۆڕ وا شەوێ دوان ئیدارەمان کرد.. بەلام ترسەکە ئەوەندە زۆر بوو ئەگەر بتزانیایە هەر شوێنێ سەعاتێ لە مردن دوورت دەخاتەوەبۆی

نەچووی..ئێمەش هەروامان ئەزانی وەك ئەو هەموو جارەی تر کە بەلاماری ناوچەکەی داوە هەروا رۆژێ دوانە و ئەڕوات..

***ئەی پێشتر باسی ئەوەت کرد کە بەهۆی گەڕانەوەی پێشمەرگەکان و بەشێك خەڵکی دەربازبووی قەرەداخەوە هەواڵی ئەوەتان زانیوە کەچی بەناوچەکانی تر کردوە.. چۆن وات ئەزانی هەر رۆژێ دوانە و کۆتایی دێت..!؟**

ئێ ئەوخەڵکەیش کە هاتبوو لە قەرەداخ و پێشمەرگەکانیش خۆیان لە دەست سوپا رزگاریان ببو.. ئێمەش وامانزانی هەروەك لافاو دێت و هەرچی بەردەست کەوێ‌رایدەماڵێ و دەیبات و وامان ئەزانی ئێمە بەو شێوەیە رزگارمان ئەبێ..

***تاکەی لەو هەردەیا مانەوە..؟**

-هەر ئەو شەو و رۆژە لەدەشتا بووین و زەلام ناسیاو هات بەشوێنماندا وتیان حکومەت لاقەی کەس ناکات و ئەوەی گەڕاوەتەوە رزگاری بوە ئێوەش وەرنەوە..

***ئێوە بڕیاری چیتان دا..؟**

-ئێ وا بۆت ئەگێڕمەوە.. ئیتر کە ئەو زەلامانە هاتن وەعدی ئەوەشیان لە مستەشارێك وەرگرتبوو بمانگرێتە خۆی، هەر کە خۆر ئاوا بوو کەوتینە رێ لەهەردەکەوە بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبین نەکەوینە دەست سوپا زۆر بەهێمنی و پەناپەنا بە سێ سەعات لە نێوان سوپاو دێیەکان و رەبیەکانی پشتڕدا کەلەسەر جادەکان بوون خۆمان گەیاندە قادر کەرەم و هەر ئەو شەوە من گەیشتمە لای منالەکانم لەماڵ(حاجی حەسەن).

***ئەی ئەوانەی تر واپێکەوە بوون ئەوان چیان کرد..؟**

-هەر یەکەو چوە ماڵە خزم و ناسیاوێ.

***وەك بزانى خەڵكى تر هەبوون وەك ئێوە بە پیرى بانگەوازى عـافوات و بەڵێنى موستەشارەوە هاتبێتن بۆ قادر كەرەم..؟**

-قادركەرەم جمەى ئەهات، خۆى چەنێ مـەخلوقى تیـابوو ئەوەنـەى دێیەكانیش رووى تێكردبوو ماڵ وا هەبوو چەن ماڵ هاتبۆ سەریان..

***دواتر ئەو خەڵكە چیان بەسەر هات رزگاریان بوو لە ئەنفال..؟**

-ئەوەى لە دێوە زوو بەدزییەوە خـۆى گەیانـدە شـارەكان باشـتر بـوو بەلاّم ئەوىترى دواى هەمووى لە قادركەرەمـەوە سـوارى سـەیارە كـران بەرەو چەمچەماڵ و دواتر بۆ تۆپزاوا و ئیتر بۆ شوێنى نادیار بران..

***تۆ خێزان و ماڵ و منالّەكەت چیان بەسەر هات..؟**

-لە قادر كەرەمەوە ئـەوان خـزم و ناسیاو گەیاندیانیانـە كـەركوك و ئەوان رزگاریان بوو بەلاّم خۆمان قورِكرا بەسەر ماندا..

***دواى ئەوەى لە قادر كەرەم و لەماڵى(حاجى حەسەن) یەكتان گرتـەوە بۆچى جارێكى تر لە منالّەكانت دابرِاى..!؟**

-كـە لـە ئـاوایى لەیـەكتر دابـرِاین و ئـەوانم نـارد بـۆ قـادر كـەرەم ، مەترسى لەسەر ئەوانبوو ئەموت خوا ئـەكات ئـەوان رزگاریـان ئـەبێ و ناكەونــە دەســتى زاڵــم، خۆمــان لــەو دەشــت و دەرەخۆمــان حەشــار ئەدەین.. كە هاتینە قادركـەرەمیش وەزعەكـە كۆتـایى نـەهاتبوو هـەتا دەبوو خراپتر دەبوو.. لەوێش كەلەیەكترى جیابوینـەوە هـەر لەخـەمى ئەوەدا بـوین كـە ژن و منالّەكانمان نەكەونـە دەست سوپاوە.. چونكە نـاموس گرانـە.. ئێمـە هـەر چۆنێ بوایـا باشـتر بـوو ئەگـەر بمـانگرن بمانكوژن.. بەلاّم ژن و منـاڵ بكەوێتە بەردەست ئـەو سـوپا زاڵمـە وەك ئەوە وابوو بـەرخ بكەوێتـە بەردەسـتى گـورگ بۆیـە خـەمى گـەورەمان ئەوانبوو كە ئەوانیشمان نارد بۆ شار كەوتینە مشورى ئـەوەى كـە زوو چارەسەرێكى خۆمان بكەین..خزمێكمان ناوى(فـەرهاد)بـوو جـاش بـوو

رانیدێکی برادەری هەبوو تەگبیرمان کرد بەیانی زوو ئەو بچێتە لای نەو رائیدە و قسەیەکی لەگەڵ بکات بزانێ چی ئەڵێ.. هەر بەیانی زوو چوبۆلای و گەڕایەوە ووتی وتویەتی هەر چۆنێکە عیلاجی خۆیان بکەن وەزعەکە زۆر پڕ مەترسیە و من هیچم پێناکرێ..

***ئەی چیتان کرد..!؟**

-پەلەمەکە ئەوەنیە وا بۆت ئەگێڕمەوە.. ئیتر نائومێد بوین لەوەی بتوانین لەماڵاندا خۆمان بشارینەوە..

***تۆ وتت کە لە کەلوەزەکە بوین هاتن بە شوێنماندا و بەڵێنیان لە مستەشارێك وەرگرتبوو کە بمانگرێتە خۆی، ئەی بۆ نەچوون بۆلای..!؟**

-ئەوەی راستی بێت ئێمە ئەگەر زۆر لەناچاریدا نەبوایە و دەرویەکی ترمان شك ببردایە ناچوینە لای مستەشار چونکە لای مستەشار دەبوو ببین بە(جاش) کە لای ئێمە جاشێتی زۆر عەبێکی گەورەبوو، بۆیە سەرەتا ویستمان بەدوای چارەسەرێکی تردا بگەڕێین، بەلام کە نائومێدبوین(حاجی حەسەن)مان نارد چوە لای (شێخ موعتەسەم) برای شێخ جەعفەر.. کە فەوجی خەفیفەی هەبوو فەوجی(٦٤).. ئەو بەڵێنی دا کە ئەمانپارێزێ، بەلام یەك مەرجی هەبوو کە هەریەکی چەکێ کلاشینکۆف بکرین و بە چەکەوە تەسلیمی بین..

***ئەو مەرجەتان قبوڵ کرد..؟**

-هەر گەڵێ مەمنونیش بووین، هیچ چارەیەکی تر نەبوو..

***چۆن چەکتان دابین کرد..؟**

-ئێمە زۆر کەس لە لادێ چەکی خۆی هەبوو ئەوەشی نەیبوو ناچار کڕی.. چونکە ئەگەر چەکت پێنەبوایە وەریان نەئەگرتی..

***تۆ خۆت چۆن چەکت دابین کرد..؟**

-من هەر لە ئاوایی چەکم هەبوو، هەر ئەو چەکەم پێبوو بەو چەکەوە تەسلیم بووم بەفەوجی(٦٤) و بە حساب و وەعدی (شێخ موعتەسەم) کە هەر تەسلیمی بوین لای خۆی ناونوسمان ئەکات و ئەمانکات بە(جاش) و بەهۆی جاشێتیەوە ترسی گرتنمان نامێنێ و لەم لافاوەش رزگارمان ئەبێ..

***چۆن تەسلیم بوون، یان چۆن لە ماڵەکانەوە توانیتان بگەنە لای شێخ موعتەسەم..؟**

-سەیارە هاتە شوێنمان لەماڵی(حاجی حەسەنەوە) بردمانی بۆ (چەم ئالیاوا) فەوجەکەیان بارەگاکەی لەوێ بوو..

***ئێوە چەند کەس ئەبوون بەوشێوەیە چونە لای مستەشار ..؟**

-ئێمە کەچوین یەکەمجار وامانزانی هەر ئەوەنە کەسەین و دڵمان بەوە خۆش بوو ئەم(دە پانزە) زەلامە لەناو فەوجەکەدا هەر بە ئاسانی بزر ئەبین و ئەتوانێ هەر یەکی لەگەڵ کۆمەڵێ جاشی تردا لە رەبایەیەك دامان بنێ و کەسیش نەزانێ، بەلأم کاتێ چوینە بارەگای فەوج تەماشامان کرد دنیایەك خەڵکی لێیە..ئەتوت زەلامێ تر لە قادرکەرەمدا نەماوە و هەمووی هاتۆتە ئەو فەوجە ئەوەنە گەنجی لێبوو هەمووی بەچەکەوە کە ئەگەر پەلاماری ئەو جەیشەیان بدایە بەهەموو حکومەت بەرگەی نەدەگرت..!

***جگە لەئێوە کە لەناچاری‌دا پەناتان بۆ بارەگای فەوجی (٦٤) برد، تەنها چەکداری کوردی لێ بوو. واتا تەنها جاش لەوێ بوون؟**

-تا دوو رۆژ بەڵێ..

***ئەی دوای ئەو دوو رۆژە؟**

-هەندێ عەسکەری هاتن بۆ لای فەوجەکەو تێکەڵ بەفەوجەکە بوون..

***ئەو دوو رۆژەی کەهیچ عەسکەری لای فەوجەکەتان نەبوو، هیچ بیرتان لەوە نەکردەوە کە لەوێش خۆتان رزگار بکەن؟**

ئێ بۆ کوێ بچین ئەوە باشترین شوێن بوو کەهەڵمانبژارد بوو..!

***ئەی لەو دوو رۆژەدا هیچ جارێك قسەتان لەگەڵ مستەشارەکەدا نەکرد کەچیتان لێ دەکات..؟**

زۆر خەڵکی لێ بوو ئێمە هەر نەدەگەیشتینە موستەشارەکە تا ئەو پرسیارەی لێ بکەین..

***ئەگەر بتانوویستایا بچن ئەو پرسیارەی لێ بکەن کەس هەبوو رێگربێ لەبەردەمتان..؟**

-وەڵاهی نازانم، ئێمە هیچ بیرمان لەوە نەکردەوە کەبچین ئەو پرسیارەی لێ بکەین و لێیشی بەگومان نەبووین تا پرسیار بکەین، ئێمە مەمنون بووین کە داڵدەمانی دابوو.. چیمان لێ دەکات، ئێمە پەنامان بۆ برد بوو لەدەستی سوپا بمانپارێزێ ئەویش مەرجی ئەوەبوو کە بەچەکەوە بچین و دەمانپارێزێ، ئەو کاتەی لەوێش بووین و کەس بەلامان دا ناهات، لای ئێمە ئەوەبوو کەئەو پیاوە (موستەشارەکە) وەعدی خۆی بردۆتە سەرو پاراستوومانێتی..

***لەو دوو رۆژەدا هیچ گومانێکت لا دروست نەبوو کەموستەشارەکە ئێوەی هەڵخەڵەتاندبێ کەوتویەتی بەچەکەوە تەسلیم بن بۆ ئەوەی بووبێ کەوەك پێشمەرگە تەسلیمتان بکات..؟**

لەوە ئەترسام بەڵام دڵنیای ئەوەم نەبوو کەئەوەنیەتی موستەشارەکە بێت..

***دوای ئەو دوو رۆژە کەئەڵێی (سەرباز) هاتن و تێکەڵ بە(فەوجەکەتان) بوون.. هەستت بەوە نەکرد کەئەم سەربازانە بۆ گرتنی ئێوە بێ..!؟**

-ئێمە هەر چەندە چەکیشمان پێ بوو لەناو فەوجی جاشیش دا بووین بەڵام هەر لە(عەسکەر)ی ئەترساین کەئەوانیش هاتن ئێمە ئەو ترسەماں لێ نیشت کەبۆ گرتنی ئێمە بێت بەڵام ئەوان بەهیچ شێوەیەك خۆیان وا نیشان نەدا کەبۆ کارێکی لەو جۆرە هاتوون.

***ئەی وەك ئاگادار بی موستەشارەکە هیچی لەو بارەیەوە نەووت، قسەیەك بکات یاخود بەسەربازەکان بڵێ بۆچی هاتوون بۆ ناو فەوجەکەی ئەو،یان بەرنامەتان چیە..؟**

-ئەگەر وتبێتیشی من نازانم.

***لەو ماوەیەی کەسەربازەکان لەوێ بوون تا ئەو کاتەی دەستگیرکران لەو دوو نێوانەدا کەسی تر نەهات کەوەك ئێوە پەنای بۆ (موستەشارەکە) هێنابێ..؟**

-بەردەوام خەڵکی تر ئەهاتو لەدواجاردا وای لێ هات ئەو (چەمە) هەمووی پڕ بوو ئەوەندە خەڵك خۆی گەیاندبووە لای شێخ موعتەسەم و داوایان لێ کردبوو کەپەنایان بدات..

***جگە لەشێخ موعتەسەم هیچ موستەشارێکی تر هەبوو خەڵك بگرێتە خۆی..؟**

-موستەشارەکانیش بوو بوون بەدوو بەشەوە هەبوو خەڵکێکی زۆری گرتە خۆیو چەكو تاخمی پێیان کڕی کەبەحساب بەو شێوەیە بیانپارێزێو دواتر هەموویان وێنەیان گیراو درایە تەلەفزیۆن کەئەمانە بەکرێگیراوی ئێرانن تەسلیم بوونەتەوە..

***بەکرێ گیراوی ئێران مەبەستیان لەچی بوو..؟**

-مەبەستیان پێشمەرگە بوو..

***ئەی بەشەکەی تری موستەشارەکان..؟**

-ئەو بەشەی تریان کە کەمترینیانە کەسیان نەگرتە خۆیان..!

***تۆ پێت وایە کە کەسیان نەگرتە خۆیان زانیوویانە کەدوایی ناتوانن بیانپارێزن و زانیوویانە کەئەنجامەکەی چی‌یە.. یاخود بۆیە کەسیان ناگرتە خۆیان تاکەس رزگاری نەبێ و هەموویان بکەونە بەردەستی سووپاوە.. یان لەترسا بووە کەنەبا رژێم بزانێ و بەچاوی ئەوان تێیان بڕوانێ..؟**

-ئەوەیان مەگەر خوا بیزانێ کەنیەتی ئەوان چی بووە... تۆ بۆ ناچی مقابەلەی خۆیان بکەی بلێ لەئەنفال دا بۆچی کەستان نەگرتە خۆتان، وەڵامەکەی لای ئەوانە ئەوان خۆیان ئەزانن..!! یان بۆ چەکتان بەو هەموو گەنجە کڕی و تەسلیمتان کرد..!؟

***راستە بەڵام قسەمان بۆ ناکەن..!؟**

-ئێ ئەوان خۆیان قسە ناکەن منیش ناتوانم لەجێی ئەوان وەڵامت بدەمەوە..

***کەی هەستتان بەوە کرد کە مەترسیتان لەسەرە و دەستگیر دەکرێن..!؟**

-دوای ئەوەی عەسکەری هات و هاتوو چۆی تر دروست بوو بۆ لای سەربازەکان..رۆژێك هەلیکۆپتەرێك هات نیشتەوە(بارق)بوو.. لە لایەن شێخ موعتەسەم موستەشارەکەو ئامر سریەکانەوە پێشوازیان لێکرد (دوو بۆ سێ) سەعات (بارق)لایان مایەوە ئەوان پێکەوە بوون قسەیان دەکرد، ئێمە بێ ئەوەی بزانین باسی چیدەکەن وەك ئەوەی لە دڵمانی دابێ کە بۆ گرتنی ئێمە هاتبێ ئاوا ئەترساین چونکە ئەو (بارق)ە گەلێ زاڵم بوو..ئەمانووت هەر بۆ گرتنمان هاتووە.. بەڵام دوای کەوتنە نیشان نانەوە..

***کێ..؟**

-بارق و شێخ موعتەسەم نیشانیان نایەوە و تەقەیان لێدەکرد.. دیاربوو کەیفیان پێدەهات هەر (حیلکە حیلکیان بوو) پێدەکەنین.. تا ئەوکاتەی (بارق)رۆیی دوای ئەوە کەوتنە ناونوس کردن و تەحقیق

کردن لێمان.. ژمارەی چەك ناوی سیانی.. پیشە و کۆمەڵێ پرسیاریان کــرد و ئەیاننوســی و دوای ناونوســینەکە(مصــور)هــات کەوتــە وێنــەگرتنمان بــە کــامێرای تەلــەفزیۆنی ئــیتر بــەجارێ زراومــان چــوو وتمان بەخوا دیارە ئەمجارەیان تیا ئەچین..!

***کاتێ وێنەتان گیرا، چەکەکانتان پێبوو..؟**

-ئا، ئا.. بەچەکەوە رەسممانیان گرت..

***هەستتان بەچی کرد..؟**

-وەڵایی هەرچەندە هێشتا هەر چەکمان پێبوو بەڵام هەستمان کــرد کە ئێمەزیندانین..

***ئەی هەستتان بەوە دەکرد کە وەك زینــدانی وان بۆچــی بیرتــان لــەخۆ رزگارکردن نەکردەوە لە کاتێکدا کە هێشتا چەکدارن..!؟**

-ئەمە تۆ دوو سێ جارە باسی خۆ رزگار کردن بکــەی، چــۆن خــۆمــان رزگار بکردایە..!؟!

***ئێوە کە هەستتان بەوە کرد کە دەستگیر دەکرێن و باسی ئەوەت کــرد کە ژمارەمان زۆر بوو ئەو هەموو چەکدارە پێکەوە بڕیاری ئەوەتان بدایە کــە ئەوە قبوڵ نەکەن..!؟**

**-بــەخوا پرســیارێ ســەیرە.. کاکــە، ئــەو هــەموو پێشــمەرگەیەی ناوچــەکە هیچی پێنــەکرا و زۆری وەك ئێمــە تەســلیم بوونــەوە، ئــیتر ئێمە چیمان پێدەکرا..**

***پێشمەرگەش هەبوو تەسلیم بەو فەوجە بوبێت..!؟**

-بەڵێ، زۆریش هەبوو..

***ئــەوانیش وەك ئێــوە وابــوون، چــەکداریش بــوون و چــاوەڕێی قــەدەر بوون..؟**

-هەمووومان وەك یەك وابووین.. تەگبیر کەرمان نەبوو تەگبیرکەر..!

***ئەگەر کەسێك هەبوایە ڕێنمایی ئەو خەڵکەی بکردبا بە بۆچونی تۆ ئەنجامەکەی چۆن دەبوو..!؟**

هەر چۆنێك بوایە وەك ئێستا نەدەبوو..

***مەبەستت چیە وەك ئێستا نەدەبوو..!؟**

نێ ئەو خەڵکە هەمووی تیاچوو.. ئەگەر هەرچیەکمان بکردایە ئەنجامەکەی لەوە خراپتر نابوو کە ئێستا ئەیبینی..

***کەواتا بەهۆی سەرگەردانی خۆتانەوە واتان بەسەر هات..؟**

بەهۆی سەرگەردانی خۆمانەوە نەبوو، بەرنامەی حکومەت بوو، بەلاّم ئەگەر هەموومان ئاوا سەرمان لێ نەشێوایا بەشێکی ئەو خەڵکە هەر ڕزگاری ئەبوو..

***بۆ نمونە خەڵکەکە چیبکردایا ڕزگاری دەبوو..؟**

وەلاّی نازانم ئێستا وادەڵێم، بەلاّم ئەوکاتە و لەکاتی ڕووداوەکاندا بەقەدەر کونی دەرزییەك روناکی نەمابوو.. ئەو هەموو خەڵکە لە فەوجێکدا کۆببوینەوە ئەگەر هەر بڕیارێکمان بدایا ڕەنگە هەر تیابچوینایا.. چونکە سەرباز هەموو ناوچەکەی گرتبوو نەك تەنها نزیك و دەورووبەری فەوجەکەی ئێمە، بەلاّم ئێستا ئەڵێم ڕەنگە هەمومان تیانەچوایاین.

***ئەی لەو حاڵەتانەدا کە وێنەتان گیرا و هەستتان بەوە دەکرد کە کار لەکار ترازاوە و دەستگیر دەکرێن.. هیچ قسەیەکتان لەگەڵ مستەشارەکەدا نەکرد.. پێی بڵێن کوا بەڵێنەکەت ..!؟**

بەو وەزعەی ئێمە مستەشارەکەیش وەك ئێمە سەری سوڕمابوو، چونکە ئەویش چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد کە روویدا..

***خۆی وای ووت..؟**

-کێ..؟

***موستەشارەکە(شێخ موعتەسەم)..!؟**

-نەخێر، خۆی وای نەووت بەڵام دیاربوو ئەویش وەزعەکەی بەلاوە سەیر بوو..

***چۆن ئەزانی وەزعەکەی بەلاوە سەیر بوو.. کێ ئەڵێ ئەوە رێکەوتنی نێوان(شێخ موعتەسەم و بارق) نەبووە..؟**

-نا، ئەزانم کە فێڵیشیان لە شێخ موعتەسەم کردبوو..

***کێ فێڵی لێ کردبوو..؟**

-حکومەت..

*** بۆ..؟.**

-بەویان نەوتبوو ئەو خەڵکەی ئەیگرنە خۆتان دوای ئەبێ تەسلیم بکرێن..

***کاك فەرەج ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە.. رۆژێك دێت مەسەلەی ئەنفال بایەخی زۆری پێ ئەدرێ و وەك ئێستا بەفەرامۆشکراوی نامێنێ..بە وردی لەلایەن کورد خۆیەوە خوێندنەوەی بۆ دەکرێت.. مەسەلەیەکی زۆر گرنگە رادەی بەشداری کردنی کورد خۆی لە ئەنفالدا بزانرێ.. بە تایبەتیش موستەشارە کوردەکان، کە یەکیان(شێخ موعتەسەم)بوو ئەوەی ئێوەی تەسلیم کرد.. بۆیە داوات لێدەکەم لەم وەڵامانەدا زیاتر خۆت لەگەڵ (زاکیرەتدا) ماندوو بکە بۆ ئەوەی باشتر شتەکانت بیر بێتەوە.. من پرسیارەکەم ئەوەبوو کە ئێوەبە (شێخ موعتەسەم)تان ووت مەترسیمان لەسەرە.. بۆ ئەو وێنانە دەگرن.. بۆ ناومان دەنووسن.. بۆ تەحقیق دەکەن.. ئەم سەربازانە چین.. ئەم شتانەتان نەپرسی..!؟**

-ئێمە لەبەر ئەوەی پێمان وترابووکە بەچەکەوە تەسلیم بین نەشر دەکرێن و لەفەوجەکەدا وەك جاشەکانی تر حیساب دەکرێن.. راستیت دەوێ تا ئەوکاتەی چەك کراین و خراینە سەیارەشەوە، هەر بڕوامان

بــه بەڵێنەکـەی موستەشـارەکە هـەبوو تـا نــاو لیواکـەی چەمچـەماڵ ئەوکاتەی بەیەکجارەکی نائومێد بووین..

***من جارێکی تر دەپرسمەوە لە شێخ موعتەسەمتان پرسی ..!؟**

خەڵکەکە زۆر زۆر بووین لەناو خۆماندا شتمان زۆر لێـك ئەدایـەوە و هەزار و یەك پرسیارمان دەکرد، هەموو ئەوانـەی تـۆ ئـەیڵێ و ئـەبێ چیمان لێ بکەن، سەد جار ئەمانەمان لەیەکتری پرسی..

***من مەبەستم خۆتان نیە.. ناڵێم لەیەکتریتان پرسی یان نا..ئەڵێم لە شێخ موعتەسەمتان پرسی ..؟**

-من خۆم نەمپرسی..

***ئەی کەسێك هەبوو لای تۆ بڵێ خـۆم بـە شـێخ موعتەسـەمم ووت و ئـەو وەڵامەکەی وابوو..!؟**

-نـەء..

***ئەی ئیتر چۆن ئەزانی شـێخ موعتەسـەم وەك ئێـوە حاڵەتەکـەی بـەلاوە سەیر بوو.. چۆن ئەزانی ئەو ئاگای لە هەموو شتەکان نەبوو..؟**

-ئـاخر ئـەو زۆر شـپرزە بـوو بـوو.. لەگـەڵ یـەك دوو زابتـدا هـەر بەیەکدا ئەهاتن و قرەقرپان بوو..

***لەوکاتەدا کە شێخ موعتەسـەم وزابتـەکانی وەك تـۆ دەڵێـی قرەقرپـان بوو.. تۆ چەنێك لێیانەوە دوور بووی..؟**

-وەڵای ئێمە دوور بوین لێیانەوە، بۆ..؟

***مەبەستم ئەوەیە بزانم گوێت لە قسەکانیان بوو باسی چیدەکەن..؟**

-نەوەڵا ئەوان دوور بوون لـە ئێمـەوە.. گوێمـان لەقسـەکانیان نـەبوو تەنها چاومان لێبوو..

***ئەی چۆن ئـەزانی کـە قرەقرپـان بـوو.. کــێ ئـەڵێ بۆخۆیـان قسـەی خۆشیان نەکردووە..؟**

-نـا، دیـاربوو.. ئەوکاتـەی بـارق لـەوێ بـوو خـۆ هـەر لێمانـەوە دوور بوون بەڵام ئەمانزانی کە(پێدەکەنن). ئەمەشیان ئەمانزانی کە تـوڕەن و دەست بادان و قسەکانیان دیاربوو (قرەقڕ)بوو..

***تا کەی ئەو حاڵەتە لـەنێوان(شـێخ موعتەسـەم و زابتەکانـدا) بـەردەوام بوو..؟**

-تا ئەوکاتەی گەیاندمانیانە(مەفرەقەکەی بانی مەقان) لەوێش سـێ چارەك بۆ سەعاتێ ئێمەیان راگرت و هـەر(قڕەقڕیـان بـوو) دوای ئـەوە ئێمەیان برد بۆ چەمچەماڵ..

***بە چەکەکانتانەوە بردتانیان..؟**

-نا، نا.. هەر لە(چەم ئالیاوا) چەکمانیان کرد..

*** ئەوانەی چەکتانیان کرد هەر ئەو سەربازانە بوون کە پێشتر هاتبوون بـۆ لاتان یان سەربازی تر هاتن..؟**

- کـە بـارق هـات ئـیتر هـەروا سـەیارەی سـەربازی بـوو ئـەهات و سـەربازی هـەڵ ئەڕشـت، تـا ئەوەنـە زۆر بـوون هەریـەکێ لـە ئێمـە دە سەربازی بەردەکەوت..

*** چۆن چەکتانیان کرد هەرکەس لە راستی خۆیـەوە پـەلاماری دان یـان بەو ناونووسینەی‌کە پێشتر ناونووس کران..؟**

-دوای ناونووسـینەکە تـا ئـەو کاتـەی چـەکمانیان کـرد ئەوەنـدەی نەبرد.. کە ناونووس کراین و هەمووی تەواو بوو ئەوەندەی پێنەچوو کە چەکمانیان کرد..

***ناڵێم چەند دوای ناونوسینەکە چەك کران، مەبەستم ئەوەیە چۆن چـەك کران..؟**

-کە ناومانیان نووسی کۆمەڵ کۆمەڵ کـراین.. چـونکە تـەنها لەیـەك شـوێن ناومانیـان نانووسـی.. لــە چــەندلاوە ناویــان ئەنووســی و

تەحقیقیان دەکرد و ریز دەکراین.. دوای ئەوەی تەواو بووین ئەو جا دەبوو هەر کۆمەڵە و لەبەردەم خۆیاندا یەکە یەکە بچن چەك و تاقمەکە دابنێن و لە لایەکی ترەوە ریزبن..

***کێ ئاوا ئیعازی ئەدا پێتان.. وا ریزبن.. چەکەکانتان لەوێ دانێن..؟**

-ئەوانەی فەرمانیان ئەکرد ئەفسەربوون.

***ئەی کاتێ چەك کران، شێخ موعتەسەم لەکوێ بوو..؟**

-ئەویش لەوێ بوو..

***بەدیارتانەوە بوو کاتێ چەکیان کردن..؟**

-نا، نا.. ئەو هەر لەشوێنەکەی خۆی بوو لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی تردا.. بەڵام چاوی لێبوو.. دواتر هات بۆلامان.

*** دوای ئەوەی چەك کران موستەشارەکە هات بۆلاتان..؟**

- بەڵێ.

*** هیچ قسەیەکی نەکرد..؟**

- با، وتی ئەتانبەم بۆ سلێمانی و نەشرتان ئەکەم.

*** ئەی کەس پێی نەوت وا چەك کراین و زیندانی دەکرێین..؟**

- گوێم لێ نەبوو کەس وابڵێ.

*** ئەی دوای ئەوە چیتر رووی دا.؟**

- سەیارەیان هێنا و کەوتنە بارکردنی ئێمە..

*** سەیارەکان چی بوون.. سەربازی..؟**

- نەء   هەمووی کۆستەر بوو..

*** ئەی شۆفێرەکانیان..؟**

- هەر مەدەنی بوون..

*** هەر سەیارەی چەند کەسیان تێکرد..؟**

سەیارەی ٢١ نەفەری بوون هەر سەیارەی دوو سەرباز سەرکەوت لەگەڵماندا و ئیتر هەموو کورسیەکانی تری بۆ ئێمە بوو..

*** چەند سەیارە ئەبوون..؟**

- زۆر زۆر بوو.. نازانم..!

*** کاتێ دەخرانە ناو سەیارەوە کە سەرباز لەگەڵتان سواربوو.. ئەمجارە شێخ موعتەسەم چیدەووت..؟**

ئەوکاتەی کە بەرێز دەمانیان خستە ناوسەیارەوە هەر ئەیوت مەترسن بۆ سلێمانیە و قسەیەکی تریشی کرد..

*** وتی چی..؟**

وتی کاکە کێ چەکی نیە من کەفالەتی ناکەم..

*** کەس هەبوو بێچەك هاتبێ..؟**

- بەڵێ، هەرچەند هەر یەکەم رۆژ پێمانی ووت کەس بێچەك وەرناگرم بەلاَم هەبوو چەکی پێپەیدا نەکرابوو. من برایەکم چەکی بۆ دابین نەکرا بوو پێش ئەوەی سواری کۆستەرەکە بین بە شێخ موعتەسەمی ووت من چەکم نەهێنناوە..

*** شێخ موعتەسەم وەلاَمی چی بوو..؟**

وتی چاوت دەرچێ خوا ئەکا ئیعدام ئەکرێی.. پێتانم نەوت کەس بێچەك نەیات و من کەفالەتی ناکەم..

*** کەواتا شێخ موعتەسەم پشت ئەستور بوە بەوەی کە ئەوی چەکدار بوبێ توانای پاراستنی هەیە..؟**

وای ئەوت بەلاَم دوای وا دەرنەچوو..

*** کەی بوو لە فەوجەکە بەرێخران..؟**

دوای عەسر بوو..

*** لەناو سەیارەکە هیچ قسەیەکتان لەگەڵ سەربازە حەرەسەکان نەکرد.. بڵێن بۆ کوێمان ئەبەن.. یاخود بڵێن بۆ زیندانمان دەکەن..؟**

ئەوان حەرەسی ئێمە بوون..ئێمەش نەمان ئەزانی سجنین.. هەر وامان زانی بۆ سلێمانی بۆ نەشر کردنمان ئەبەن تا ئەوکاتەی گەیشتینە بانی مەقان شێخ موعتەسەم خۆی لەگەڵ قافڵەی سەیارەکانمان دابوو لە بانی مەقان لە مەفرەقەکە زابتەکان ئەیانویست بەرەو کەرکوك بمانبەن.. شێخ موعتەسەم ئەیویست بەرەو سلێمانی دیاربوو لەچەم ئالیاوا لەبارەگای فەوجەکەبە شێخ موعتەسەمیان وتبوو کە ئەیانبەین بۆ سلێمانی بۆیە وتم فێڵیان لەویش کردبوو چونکە لە(بانی مەقان) کاتێ ئەیانویست بەرەو کەرکوك بەڕێمان کەن شێخ موعتەسەم زۆر پێی تێك چوو.. لەسەر جادەکە سێ چارەك بۆ سەعاتێ هەر لەگەڵ زابتەکاندا هەرای بوو لەسەر ئەوەی کە نەهێڵێ بۆ کەرکوك بمانبەن.. بەوەیا ئەڵێم ڕەنگە موستەشارەکان نەیانزانیبێ کاتێ خەڵکیان گرتە خۆیان ئەنجامەکەی وا ئەکەوێتەوە.. چونکە شێخ موعتەسەم لە فەوجەکە لە(چەم ئالیاوا) کە سەرکەوتین وتی مەترسن ئەتانبەین بۆ سلێمانی و نەشرتان ئەکەم لەبانی مەقانیش زۆر(قرەقڕی کرد) لەسەرمان کە ئەگەر خۆی ئاگای لە هەموو شتێ بوایا و ڕازی بوایا لەسەری هەر لەبارەگای فەوجەکە کە سوپا هات و چەکمانیان کرد خۆی ئەدزیەوە..

دیاربوو لە(بانی مەقانیش)کە نەیهێشت بەرەو کەرکوك بچین و بەرەو چەمچەماڵ هێنامانیان هەر لەسەر پێداگری(شێخ موعتەسەم)بوو ڕەنگە پێان وتبێ وا ئەیان بەین بۆ سلێمانی. چونکە دوای ئەوەی بەرەو چەمچەماڵ بوینەوە ئیتر (شێخ موعتەسەم) خۆی ڕۆیشت.. سەیارەکان لەمەقان هاتنە خوارەوە و لەبەردەم لیواکەی

چەمچەماڵ کە سەربازی زۆری لێبوو رامانیان گرت و بەریز بەدوای یەکتریدا هەموو قافڵەی سەیارەکانیان بردە ناو لیواکەی چەمچەماڵەوە.

*** کە ئێوەیان بردە ناو لیواکەی چەمچەماڵ خەڵکی تری لێبوو مەبەستم لە خەڵکی گوندەکانە کە دەستگیرکرابێ..؟**

- خەڵکێکی زۆری لێبوو.. پڕی ژن و منداڵ بوو.. تەرەکتەرێکی زۆری لێبوو شەرواڵی ژن کرابۆ چەنچی عەرەبانەی تەرەکتەرەکەوە، کە ئەو دیمەنەم بینی وەك ئەوە وابوو گوللەیەك بەسەر دڵمەوە بنێن.. ئیتر هەمومان نائومێد بوین نەك لەوەی کە نەشر ناکرێین. بەڵکو لە ژیانیش، وتم تازە تەواو چاومان بەدونیای رۆشن ناکەوێتەوە.. چونکە بەدیمەنی ئەو هەموو ژن ومناڵە کە لەناو لیواکەی چەمچەماڵدا خڕکرابوونە یەکتریدا.. ئیتر دڵنیابووم لەوەی کە ئەو هەموو قسەیەی دەکرا کە گوایە دەستی لە ژن و منداڵ نەپاراستووە و هەموو خەڵکەکەی گرتوە لەوێ کە چاوم بەو ژن ومناڵە کەوت ژن ومناڵەکانی خۆم بیرکەوتەوە ترسی ئەوەم لێ نیشت کە ئێستا ئەوانیش گیراون.

*** ئەی سەربازی زۆری لێبوو..؟**

- هەر لە ئەقڵدا نەبوو.. نازانم ئەم حکومەتە سەگبابە ئەو هەموو سەربازەی لەکوێ بوو.. خوا ئاگادارە ئەتوت دەنکە تەزبیحە بەدوای یەکتریەوە بەڕیز وەستابوون و پاسەوانی لیواکە بوون کە پڕبوو لەژن و منداڵ و قوڕ بەسەری وەك ئێمە.

*** چەنێ لە لیواکەی چەمچەماڵ هێشتانیانەوە.؟**

- نزیکەی ٣ چارەکە سەعاتێ.

*** لە لیوای چەمچەماڵ تێکەڵ ئەو ژن و منالأنەتانیان کرد یاخود بەجیا لەوان ئێوەیان دانا..؟**

ئێمە هەر لەناو سەیارەکان بوین.

*** داتانیان نەبەزاند..؟**

نەخێر.

*** ئەی بۆچی ئەو سێ چارەکە سەعاتە راتانیان گرد..؟**

- نازانم..

*** سەیارەکان وا ئێوەی تیابوون برانە کوێی لیواکەوە..؟**

- ناو لیواکە هەمووی پڕی ژن و منالْ بوو هەر لەسەر ئەو جادەیە رامانیان گرت وا ئەچوو بۆناو لیواکە..

*** هەستت بەهیچ شتێ نەکرد، یا ئێستا چۆنی لێک ئەدەیتەوە پێت وایە بۆچی ئێوەیان بەو شێوەیە لە سەیارە راگرتووە..؟**

- شوێن نەبوو دامان بگرنە کوێ..

*** ئەی کە شوێن نەبوو بۆچی براونەتە ئەوێ..؟**

- وەلآی رەنگە بۆ ئەوەبوبێ کە بەچاوی خۆمان ئەو هەموو ژن و منالە ببینین و بزانین کەچییان بەسەر هاتووە.

*** لەماوەی ئەو سێ چارەکە سەعاتەدا هیچ کەسێك نەهاتە لاتان یاخود هیچ قسەیەکتان لەگەلْ سەربازە پاسەوانەکانی ناو سەیارەکەتاندا نەکرد..؟**

- ئێمە خۆمان قسەمان نەکرد ئەگەر قسەشت بکردایە ئەوان جوابی ئێمەیان نادایەوە بەلآم هاتنە لامان و سەر لەنوێ ناومانیان نووسییەوە..

*** کێ بوون ئەوانەی ناوەکانیان ئەنووسی..؟**

- هەر سەرباز بوون.. نازانم پلەیان چیبوو بەلآم عەسکەری بوون.

*** چۆن ناویان ئەنووسی.. داوای ناسنامەیان دەکرد یان هەر کەسێ لە راستی خۆیەوە ناوی خۆی دەوت..؟**

- ئەوان لەناو دەرگای سەیارەکە بوون و بەریز یەکە یەکە ناوی خۆمان دەوت و ئەیاننوسی..

*** هیچ قسەیەکی تریان لەگەڵتان نەکرد..؟**

- بەرەوەلا پێمانی ووت هەموتان رەمی دەکەین..

*** ئەوکاتە قسەکەی ئەوتان چۆن وەرگرت..؟**

- ئەوان دیاربوو بەراستیان بوو کە ئەیان ووت هەموتان رەمی دەکەین.. بەلاّم ئێمە وامان ئەزانی هەر بۆ ئەوە ئەو قسەیەدەکەن کە بمانترسێنن..

*** دوای ناونووسینەکە خستانیانە رێ..؟**

- ئەوەنەی پێنەچوو.. ئا هەردوای ناونووسینەکە دێوریان بەسەیارەکانمان کرد و کەوتینەرێ..

*** سەیارەکانیشان نەگۆڕی..؟**

- یەعنی چۆن..!؟

*** مەبەستم ئەوەیە هەر بەو سەیارانەی لەچەم ئالیاواوە هێنرابوون بەو سەیارانە بران یاخود خرانە ناو سەیارەی ترەوە..؟**

- هەر ئەو سەیارانە بوون..

*** تەنها ئەو وەجبە سەیارەیەی ئێوە بوون بردتانیان یان کەسی تریان خستە تەکتان..؟**

**- با، حیمایەی تر و کۆمەڵێ سەیارەی تریش کە پڕبوون لە خەڵك ئەوانیشیان خستە ناو قافڵەکەی ئێمەوە.**

*** جگە لە سەرباز چەکداری کورد لە لیوای چەمچەماڵ نەبوون..؟**

- ئێمە هەر لە سەیارەدا بوین، ئەوەی لە ئێمەوە دیاربوو هەمووی سەرباز بوو ئیتر نازانم کورد بوون یان عەرەب..

*** مەبەستم لە جاش بوو..؟**

نا، نا.. کەسم نەبینی..

*** کەی بوو لە لیواکەی چەمچەماڵ بەڕێخران..؟**

دوای مەغریب بوو..

*** تاریك داهاتبوو..؟**

- ئا.. چونکە سەیارەکان لایتیان داگیرساندبوو.

*** بەرەو کوێ بردتانیان..؟**

لە چەمچەماڵەوە جارێکی تر بەرەو مەقان سەرکەوتن..

*** هەستت بەچی دەکرد..؟**

هەست بەچی بکەین، ولاّیی خۆشمان نازانین.. لە حاڵەتی وایە لەیەك دەقەدا هەزار داڵغە لێ ئەدەی بیرت بۆ هەموو شتێ ئەچێ.. نازانم بڵێم هەستمان بەچی ئەکرد.. ولاّیی هەستمان بەوە ئەکرد کە زوڵممان لێ ئەکرێت..

*** ئەی دوای ئەوەی گەیشتنە بانی مەقان بۆ کوێی تر بران..؟**

- بۆ کەرکوك.. هەر بە جادەکەیا بردمانیان بەرەو کەرکوك.. لەناو سەیارەکە ئەمووت دیارە یان ئێمەیان تەنها بۆ ناونووسین بردووە بۆ چەمچەماڵ یان هەر لەیەکەم جار بە نیاز بوونە بمانبەن بەرەو کەرکوك بەلاّم شێخ موعتەسەم نەیهێشتووە..

*** ئێستا قەناعەتت وایە کامیان بوبێ..؟**

وەلاّیی مەگەر خوا بزانێ

*** بردتانیانە ناو کەرکوك..؟**

- نەخێر، هەر یەکسەر بردمانیان بۆ تۆپزاوا.. ئاخ تۆبزاوا..!!

*** کەی بوو گەیشتن..؟**

شەو بوو..

*** مەبەستم کاتەکەیەتی نازانی سەعات چەند بوو..؟**

ڕەنگە لەدەور (٩)ی شەو بووبێ

*** باشە خۆ نێوان چەمچەماڵ و تۆپزاوا زۆر نیە بۆ..؟**

سەیارەکان چونکە بە قافڵە بوو خێرا نەدەڕۆیشتن..

*** تۆبزاوا خەڵکی تری بۆ برابوو کاتێ ئێوەیان برد..؟**

دنیایە خەڵکی لێبوو..

*** چی بوون..!؟**

- گشتی وەك ئێمە نە دێیەکانەوە هێنرابوون..

*** مەبەستم لەوەیە ژن و منال بوون یاخود تەنها پیاو بوون..؟**

- تۆبزاوا بەخوا هەموو نەوعێکی لێبوو.. لەمنالی(قنۆرکە)وە تا بەساڵاچووی سەدساڵە..

*** چۆن بردتانیانە ژوورەوە بە سەیارەکانەوە یاخود داتانیان کرد..!؟**

- من نازانم شوێن چی بووە.. دێ بووە یان شار ، ئەیان ووت مەعەسکەری تەدریبی جەیش شەعبی بووە..زۆر گەورەبوو دەشتاییەکی زۆر گەورە هەمووی تەلبەند کرابوو کۆمەڵێ قاعەی زۆر گەورەشی لێبوو هەر لە تەلبەندەکەوە ئەیانکردە ژوورەوە ئیتر لە سەیارەکان دایان ئەبەزاند و عەسکەری دنیای لێبوو ئیتر وەك ڕەشە وڵاخ ئەتیان دایە پێش بەرەو قەعەکان لە ساحەیەکی گەورەدا ئەو خەڵکە هەمووی کۆمەڵ کۆمەڵ کرابوو، ژن بەجیا.. پیاو بەجیا، منال بەجیا.. یەك هاتوهاوارێك بوو هەر مەپرسە بڕوابکە ڕەنگە قیژ و قاو ئەو خەڵکە ڕۆژە ڕێیەك ڕۆیشتبێ.. خەڵکەکە گەلێ زۆربوون تەقدیر ناکرێ چەنێ ئەبوو..

*** ئێوەیان بەجیا وەك کۆمەڵێکی سەربەخۆ هێشتەوە یاخوا تێکەڵ بە خەڵکی ترتانیان کرد..؟**

- تێکەڵ کۆمەڵێ زلامانیان کرد..

*** خەڵكى كوێ بوون..؟**

ئينجا خەڵكى كوێ نەبوون وەڵاێى ئەگەر بڵێم خەڵك هەموو دێيەكى تيابوو درۆ نيە، لە هەر كەسێكت ئەپرسى خەڵكى كوێى هەر يەكى ناوچەيەكى ئەوت..

*** ئەوان چەنێ پێش ئێوە برابوونە ئەوێ..؟**

هەبوو هەر ئەو رۆژە برابوو هەبوو ئەيوت وا چوار رۆژە لێرەم و هەر بۆى دەهێنن و پەيتا پەيتا لێ‌ى بار ئەكەن..

*** تۆ كەسێكت ناسى لەناو ئەو خەڵكەدا كە پێش تۆ برابونە تۆبزاوا..؟**

رەنگە(٣٠)كەسم تيا ناسى بێت خەڵك ئەو دێيانەى دەوروبەرمان بوون

*** ماوەى چەنێ لەو ساحەيە هێشتانيانەوە..؟**

- وەڵاێى لەوە ئەچوو ئێمە شانسمان هەبوبێ هەر ئەو شەوە نۆرەى ناونوسينمان بەركەوت وخراينە قاعەوە، بەڵام هەبوو ئەيوت چوار رۆژە لەم ساحەيەم هەر لە سەرما خەريك بوو رەق بينەوە..

*** ناونوسينەكە چۆن بوو.. ئێوە ئەچون بەرەو شوێنێ بۆ ناونووسين ياخود خۆيان ئەهاتن ناوتانيان ئەنووسى..؟**

- لەيەك شوێن ناويان نانووسى.. لە دە لاوە ريز دەكراين بۆ بەردەم ناونووسەكان.

*** چيان ئەپرسى..؟**

- هەر لەناوى خۆتەوە تا ماڵ و منداڵ و كەس و كار و برپوابكە پرسيارى ناوى دراوسێ و خزمى دانيشتووى شاريشيان ئەكرد..

*** دواى ناونووسينەكە..؟**

دوای ناونووسینەکە لە شوێنێ تر کۆمەڵ کراین و بەپێی ئەو ناونوسینە کۆمەڵ کۆمەڵ کرابوین بەرەو قاعەکان بردمانیان هەر قاعەی لە(٥٠٠ بۆ ٦٠٠) کەسیان تێ ئەکرد..

*** تەنها زەلام بوون..؟**

- ئێمە ئا.. بەلاّم قاعەی تر هەبوو هەمووی ژن بوو هەبوو هەمووی منالّ بوو هەبوو هەمووی پیرەکان بوو.. بەلاّم ئێمە هەمووی گەنج بوو.

*** لەناونووسینەکەدا جیادەکرانەوە گەنج بەجیا و پیرەکان بەجیا..؟**

- ئا.. ئەوکاتەی ناوەکەیان ئەنووسی ئەوەی گەنج بوو هەر تەحقیقی تەواو ئەبوو دوو سەرباز ئەیانکرد بەباڵیدا بەرەو کۆمەڵی گەنجان و پیریش بەرەو کۆمەڵی پیرەکان.. کابرایەکم ئەناسی خەڵکی(حەسەن ئاوا) بوو ناوی(غفور حاجی توفیق) بوو لەگەڵ ناونووسەکەدا کردبویە موناقەشە ئەیوت من موالیدەکەم گەورەیە تا تێکەڵ بە پیرەکانم کەن. بەلاّم ئەوان خستیانە ناو ئێمەوە بە حیساب گەنجەکانەوە..

*** دیارە هەر لەوێ هەستتان بە مەترسی ئەوە دەکرد کە گەنجەکان چارەنووسێکی خراپ چاوەڕێیانە..؟**

- هەبوو بڕوای ناکرد بەو دەردە بچین کە تووش بوین، هەبوو ئەیوت رەنگە هەر گەنج بکوژن.. هەبوو ئەیوت هەرچی نێرینە هەیە ئەیکوژن.. هەبوو ئەیوت بەرمان ئەدەن ئەو کابرایەش دیاربوو وای ئەزانی ئەوەی بکرێتە ناو کۆمەڵی پیرەکانەوە رزگاری ئەبێ..

*** قاعەکان گەورەبوون..؟**

ئەرەوەلاّ لەم سەرەوە ئەو سەریت بە ئاستەم ئەبینی..

*** ژمارەی قاعەکان زۆربوون..؟**

زۆربــوون.. بــەلاّم خەلّکەکــەیش گــەلیّ زۆر بــوو لــە قاعەکانــدا هەمووی جێی نابودوە، چەنێکی لەقاعەبوو دە ئەوەنەی بەو دەشتەوە بوو..

*** ئێوە کاتیّ خرانە قاعەکانەوە، کەسی تر لەناو قاعەکە هەبوو..؟**

هەنــدیّ منــالّ و ئــەختیاری لِێبــوو ئــەوانیان دەرکــرد تــەنها ئێمــە ماینەوە کە گەنجەکان بوین..

*** ئەی ئەوانیان بۆ کویّ برد..؟**

نازانم..

*** بردیانیانە قاعەی تر یان سواری سەیارە کران.. خرانە گۆڕەپانەکــەوە، چیان لیّ کرا..؟**

-وابزانم بردیانیان بەرەو قاعەکانی ژورتر کە ئەوانەیان ژن و منــالّ و پیرەمێردی تیابوو..

*** کاتیّ خستتانیانە قاعەکەوە هیچ قسەیەکیان لەگەلّتان نەکرد..؟**

- وەك چی..!؟

*** هــەر قســەیەك بێــت ئەفســەرێك یــان ســەربازێك قســەیەکی لەگــەلّ کردبن..؟**

- ئەوەبلێی.. هەزار قسەیانِ ئەکرد.. جنێویان ئەدا کورە وەك ســەگ ئەرشانەوە..!!

*** ئەگەر هەندیّ لەو قسانەت لەبیر مابیّ..؟**

هەموویم لەبیر ماوە.. هەمووی هەر جنێو بوو..

*** جنێویان تەنها بەخۆتان ئەدا یان بەژن و خوشك و دایکیشتان..!؟**

بــەخۆمان و خوشــك و دایــك و ژن و بــاو و باپیرمــان و مــام جەلالیش..

*** مام جەلال بۆ..؟**

- وەلاّ نـازانم، پێمانیـان ئـەووت بـا جـەلال تالّـەبانی بێـت رزگارتـان کات..

*** ئێوە هیچتان نائووت..؟**

- کـێ ئـەیوێرا قسـەبکات.. وەلاّ فـزە لـە دەممـان بهاتایەتـە دەرەوە زمانمانیان ئەبڕی..

*** هیچ کەس قسەی کرد و وایان لێکردبێ..؟**

کەس نەیئەوێرا قسە بکات ئەگینا خراپتریشیان ئەکرد..

*** تا ئەوکاتەی لە توّبزاوا گواسترانەوە.. هیچ خواردنیان دا پێتان..؟**

- ئــەو شــەوەی کردمانیانــە قاعەکانــەوە کــە ئێمــە لــەدوای نیوەڕۆکەیەوە گیرابووین ئـەو شـەوە و رۆژەکەیشـی تـا ئێـوارە هیچیـان نـەدا پێمـان.. هـەر خـەریکبو لەبرسـاو لـە تینـودا بمـرین.. هـەموو لـە ترسا قورگمان ووشك بوو بوو تا ئێوارەکەی رۆژی دواتر ئەوجا هەندێ شۆربایان هێنا نازانم بڵێم چیبوو ئەگەر وەك ئێمە لەناچاریدا نەبوایا مرۆڤ تەبیعەتی ناچوە سەری بەلاّم ئێمە لەبرسا شەرمان بوو لەسـەری چونکە کەمیان هێنابوو دیاربوو هـەر بـۆ ئـەوەش کـەمیان هێنـابوو تـا بەشێکی بەری نەکەوێت..

*** ئەی ئەو خەڵکەی لە حەوشەکە بوون ئەوان نان و ئاویان دا پێیان..؟**

- نازانم.. خۆ ئەو خەڵکە یەك کۆمەڵێ نەبوو تا ئێمە بزانین نـان و ئاویان ئەدەنێ یاخود نا وەك(رانەمەڕ) بەسەر یەکدا ئەهاتن بـەردەوام هـەروا قافڵـەی سـەیارەبوو خـەڵکی تـری ئـەهێنا و دایـان ئـەگرت و ئەیاندایە پێش بۆ ناو خەڵکەکە و جار نەجارێکیش قافڵەیەك سـەیارە ئەهاتن و کۆمەڵێکیان لێ بار ئەکرد.

*** تۆ لەناو قاعەکەدا لەکوێ وە بووی..؟**

- چۆن لەکوێ وە بووم.. لەناو قاعەکە بووم..!!

*** مەبەستم لای دەرگاوە بووی تا لە درزی دەرگاوە دەرەوەت لێوە دیاربێ..!؟**

قاعەکان بە بالآی زەلام پەنجەرەی تیابوو ، رەنگە هەر قاعەی پەنجا پەنجەرەی وای تیابوبێ.

*** کەواتە تۆ خۆت لە پەنجەرەکانەوە دەرەوەت ئەبینی..؟**

هەمومان ئەمانبینی..

*** تۆ خۆت بینیت خەڵك بارکەن و لە تۆبزاواوە بیبەن بۆ شوێنێکی تر..؟**

- ئێ کەس هەیە چوبێتە تۆپزاوا و چاوی لێ نەبوبێ ئەو عالەمەیان چی لێکرد..!

*** خۆت چەند وەجبەت بینی کە لە سەیارە بار بکرێن..؟**

وەلأیی ئەتوانم سوێند بخۆم لەو دوو شەو و رۆژەدا وامن لەوێ بووم پەنجا وەجبە زیاتریان بارکردووەو خەڵکی تریان هاوردۆتە شوێنیان..

*** چۆن باریان ئەکرد.. بەریز و ناونووسین بوو یاخود هەروا بە پاڵ و ئەوی بەری بکەوتایا..؟**

هەموو ئەو خەڵکەی براوەتە تۆبزاوا ناو هەمووی نووسراوە بڕوا ناکەم یەك کەسێ هەبێ ناوی نەنووسرابێ وەجبە وەجبە ناویان ئەنووسرا و ئەکرانە کۆمەڵێك و قافڵەیەك سەیارە ئەهات ئەو کۆمەڵەی بار ئەکرد و وەجبەی تر ئامادە دەکرا..

*** چۆن پێدا رائەگەیشتن ناوی ئەو هەموو خەڵکە بنووسن ئاوا بەخێرایی..؟**

ئێ کاکە لە سەد لاوە ناونووس ناوی ئەنووسی خۆ یەك کەس نەبوو.. بەخوا رەنگە سەد دەفتەر بەدەست خەریك ناونووسین بوبێ..

*** ئەوانەی بە بەرچاوی تۆوە بارکران.. چی بوون..؟**

گشتی خەڵك بوو وەك ئێمەی قور بەسەر..

*** مەبەستم لەوەیە ژن و منالّ بوون.. گەنج بوون.. پیر بوون..!؟**

- هەمووی هەمووی بوو..

*** هەر بە تێکەڵی ئەیانبرد..؟**

- نا، نا.. کە لە دێیەکانەوە خەڵکەکەیان هێنابوو تا(تۆپزاوا) پێکەوە بوون لەوێ جیاکرانەوە ژن و منالّ بەجیا.. کچی گەنج گشتی جیاکرایەوە و بەجیابوون.. پیرە ژن و پیرە مێرد بەیەکەوە زەلامی گەنجیش هەمووی بەجیا بارکران..

*** ئەی بۆ کە ئەپرسم ئەڵێی هەمووی بوو..!؟**

- ئێ هەموویم بینی بەلآم ئاوا بەجیا جیا باردەکران..

*** ئەو سەیارانەی کە دەهاتن بۆ بردنیان چی جۆرە سەیارەیەك بوون..!؟**

- دوو جۆر بوون( سەوز و سپی) شێوەیان وەك ئیسعاف وابوو هیچ پەنجەرەی نەبوو..

*** هەر قافڵەی چەند سەیارە ئەبوون کە ئەهاتن بۆ گواستنەوەی ئەو خەڵکە..؟**

- رەنگە هەر بیست بۆ بیست و پێنج سەیارە بوبێ..

*** لە قاعەکان خەڵکیان بارئەکرد یان لە گۆڕەپانەکە..؟**

لە هەردووکی.. جاری وابوو کە سەیارەکان ئەهاتن لەبەر ئەوەی لە گۆڕپانەکە وەجبەی بۆ جیا نەکرابۆوە ئەهاتنە دیار قاعەیەك و باریان ئەکرد.. جاری وایشبوو هەر لە ساحەکە کۆمەڵ کۆمەڵ کرابوو بۆیان باریان دەکرد..

*** خەڵکەکە خۆی سوار دەبوون.. یان بەزۆر سەریانیان دەخست..؟**

- ئێمە گشتمان رەزیل بوین لەبەردەستیان کەس نەبوو بەقسەیان نەکات، بەلآم ئەوان چونکە زاڵم بوون هەر پەلاماری خەڵکەکەیان

ئەدا.. بەخوا بينيم پيرەژنی سەرسپی بەقژ رايان ئەكێشا.. پيرەمێردم ئەدی بەشەق لێيان ئەدا.

*** دەست يان چاوی خەڵكەكەيان ئابەستەوە كاتێ باردەكران..؟**

زۆر سەيربوو هەبوو دەست و چاويان دەبەستەوە و جلەكانيشيان لەبەريان دائەكەند تەنها كراس يان ژێر كراسێك و شەرواڵەكەيان لەپێدا ئەهێشتەوە و دەست و چاويانيان دەبەستەوە.. وەجبەی وايش بوو هيچيان لێيان ناكرد و سواريانيان دەكرد..

*** زۆرتر كامەيان دەست و چاوی دەبەسترا.. گەنجەكان.. ياخود پيرەكان..؟**

- نا، ئەوەی چاويان دەبەستەوە تەنها گەنجەكان بوون.. بەلآم وەجبەی گەنجەكانيش هەبوو كە دەست و چاويان نابەسترايەوە..

*** هەستتان ناكرد بۆچيە وا هەندێكی چاوی دەبەستن..!؟**

- نەوەلآ.. بەلآم ئەمانوت ديارە ئەوانەی وا دەست و چاويان ئەبەستن بۆ گوللەباران كردنە.. بۆيە ئەمان ووت خوايە رەحممان پێبكەيت و دەست و چاومان نەبەستن..

*** ئەی ئەوەنەی لە تۆپزاوابووی چۆن ئەو خەڵكە ئەچوونە سەر ئاو..!؟**

- ريزێ(ئاودەستی لێبوو) بە نۆرە ئەو خەڵكانەيان لە قاعەكانەوە ئەبرد بۆ سەر ئاو.. بەلآم هەتا ئەتيان برد و ئەتيان هێنايەوە لە دواوە بە قۆناغە تفەنگ لێيان ئەدای.. بەخوا هەبوو لەتاوا ميز و پيسيەكەی ئەكرد بەگيان خۆيا..

*** تۆ سەرەتا باسی ئەوەت كرد كە لە(چەم ئالياوا) براكانت لەگەڵ بوون كاتێ گيران.. من بيرم چوو بپرسم تا كوێ لەگەڵ براكانت پێكەوە بوون..؟**

- شەو و رۆژی یەکەمیش کە لە تۆپزاوا بووین و تا ئەوکاتەی بەقایمە و ناو خوێندنەوەوە هاتن و ناوی من دەرچوو بۆ رەمی کردن.. لەویٚ لەیەکتر جیا کراینەوە..!

*** بە هۆی چیەوە ناوی تۆ دەرچوو بۆ گوللەباران کردن ولە براکانت جیاکرایتەوە کەهەمووتان پێکەوە گیرابوون..؟**

- نازانم بە هۆی چیەوە بوو.. دووەم شەو بوو لە تۆپزاوا بووین سەعات ١٢ی شەو هەندێ سەربازی بەرگ سەوز هاتنە ناو قاعەکەیئێمەوە کەوتنە ناو خوێندنەوە و ناوی هەر کەسێکیان بخوێندایەتەوە لە قاعەکە ئەیانکردە دەشتەوە.. ناوی من و ئامۆزایەکمی تیابوو وەك ئەو خەڵکەی تر کراینە دەرەوەی قاعەکە و براکانم لەو وەجبەیەدا ناویان نەخوێندرایەوە و ئەوانیش وەك ئەو خەڵکەی تر کەناوی دەرنەچوو لە قاعەکەدا هێشتیانیانەوە.

*** کاتیٚ ناوەکانیان دەخوێندەوە، هیچ شتێکیان ووت.؟**

- نەخێر.. تەنها وتیان ناوی هەرکەس خوێندرایەوە بێتە دەرەوە..

*** ناوی تۆ و ئامۆزاکەت پێکەوە خوێندرایەوە، یاخود ناوی تر زۆر لە نێوانتانا بوو..؟**

- بەدوای یەکتریدا ناوەکانمان دەرچوو.

*** ئەی شەوی پێشتر بەرلەوەی بکرێنە قاعەکانەوە پێکەوە ناونووس کران..؟**

- ئا، هەمومان ئەو شەوە ناونووس کراین.

*** ئەزانم ئەو شەوە هەموتان ناونووس کران.. بەلاّم کاتیٚ ناونووس کران تۆ و ئامۆزاکەت لە ریزەکەدا بەدوای یەکتریەوە بوون..؟**

- بەڵیٚ.

*** ناوی چی بوو..؟**

- ساڵەح ئەمین ئەحمەد

*** چەند کەس ئەبوون ئەوانەی ناوتان خوێندرایەوە و کرانە دەرەوەی قاعەکەتان..؟**

ڕەنگە (١٠٠)کەس بوبێتین..

*** کاتێ هێناتانیانە دەرەوە، تێکەڵ ئەو خەڵکەی تری گۆڕەپانەکەیان کردن..!؟**

- نەخێر.. دامانیانە پێش بەرەو قاعەیەکی تر.

*** خەڵکی تری تیابوو یان چۆڵ بوو..؟**

- سەرەتا کەمی تیابوو بەڵام چەند وەجبەیەکی تریان بۆ هێناو پڕیان کرد . ئەوەندەیان بۆ هێنا بڕوا بکە تا بەیانی یەك کەس نەیتوانیوە بخەوێ چونکە زۆری هەر بە پێوەبوو تا بەیانی ڕێگەنەبوو هەر لە شوێنی خۆت دابنیشی ئەوەنە خەڵکیان تێکردبوو..

*** لە کوێ وە ئەو خەڵکانەیان هێنا.. لەناو گۆڕەپانەکەوە یان ئەوانە بوون کە تازە ئەهێنران و کرانەقاعەکەی لای ئێوەوە..؟**

- هیچیان نەبوو.. ئەوانیش وەك ئێمە هەر (١٠٠)کەسیان لە قاعەیەکەوە هێنابوو..

*** سەرجەم قاعەکە چەند کەسی تیابوو..؟**

- بەخوا ڕەنگە(٧٠٠)کەسی تیابوبێ. چونکە قاعەکەی یەکەمجار (٥٠٠)کەسیان تێکرد جێگامان سەغڵەت بوو.. بەڵام ئەم قاعەیە ئەوەنەی تێکرابوو جێی پێت بە ئاسانی نابووەوە..

*** ئەم قاعەیە بچوکتر بوو لە و قاعەیەی یەکەمجار تیایدا زیندانی کران..؟**

- نەخێر هەمویان بەقەدەر یەکتری بوون..

*** لەگەڵ خەڵکەکەدا بێگومان قسەتان کردووە.. ئەوانیش وەك ئێوە هەر کۆمەڵێك و لە قاعەیەك هەڵبژێردرابوون یان جیاکرابوونەوە.. خۆتان چیتان ئەووت..! بۆچونتان چیبوو لەبارەی ئەو جیاکردنەوەیەوە..؟**

- یەکەمجار کە ئێمە جیاکراینەوە و بردمانیانە ئەو قاعەیەی تر.. من ووتم دیارە بەزەییان پێماندا هاتوەو لەو قاعەیە جێگامان نابۆوە بۆیە هێنامانیانە ئەم قاعەیەی تر تا بتوانین تیایدا بخەوین ..بەڵام کاتێ ئەو خەڵکەی تریان هێناو ئەوەندەیان تێکرد کە جێی پێمان نەبێتەوە.. ئیتر ترسم لێ نیشت و سەد پرسیارم لادروست ئەبوو کە بۆچی جیاکراینەوە و بۆچی لەهەر قاعەیەك کۆمەڵێکیان هێناوە.. ئەمووت رەنگە بمانکوژن.. بەلآم دوایی ئەمووت باشە ئەی بۆچی ئەو خەڵکەی تر ناکوژن خۆ ئەوانیش وەك ئێمە وان.. ئەمووت رەنگە ئێمە(نەقڵ) بکەن بۆ شوێنی تر..! ئەمووت بەڵکو خوابکات بەرمان بدەن. هەزار و یەك پرسیارمان ئەکرد.. ئەو شەوە نازانم بڵێم چۆن رۆژبوەوە.. چی لەتاو دەردی خۆمان و چی لەتاو ئەو خەڵکەی وا ئەمان بینی کە چیان پێدەکرا لەو گۆڕەپانەدا، ئیتر نازانم چۆن لەتاوا روحمان دەرناچوو.. دڵمان ناتەقی.. لەداخا نەمردین..!!

*** تاکەی لەو قاعەیەدا هێشتانیانەوە..؟**

- سەعات ٩,٢٠ ئەبوو کۆمەڵێ سەیارەیان هێنایە بەردەرکی قاعەکەمان و دەرگایان لەسەرمان کردەوە و بەناو خوێندنەوە جارێکی تر بانگ کراینە دەرەوە بۆ ناو سەیارەکان.

*** چەند سەیارە ئەبوون..؟**

- وەڵایی نەم ژمارد بەلآم لە دەوری(٢٠)بیست سەیارەدا ئەبوون.

*** سەیارەکان چی بوون..؟**

هەر عەینەن ئەو سەیارانەی کە باسم کرد ئەهاتن خەلکیان تێ نەکرد و ئەیانبرد.. هەر وەك ئەوانەی تر وابوو..

*** ئاخر چی سەیارەیەك بوون..؟**

وەلاهی من تا ئەو رۆژە سەیارەی لەو جۆرەم نەبینیبوو وەك ئیسعاف وابوون بەلام نازانم ناوی چی بوو..

*** هەستت نەکرد ئەوکاتەی سواریان کردن لەناو خۆیاندا ناوی سەیارەکە بهێنن، شتێکی وات بەرگوێ نەکەوت..؟**

- نەء

*** رەنگی سەیارەکان چۆن بوو..؟**

- هەندێکی سەوز بوو.. هەندێکی سپی..

*** تۆ سواری کام جۆریان کرای.. سەوز یان سپی..؟**

- سەوز بوو..

*** چەندم سەیارەبوو کە بارکران..؟**

- بەوخوایە برا ئەوانە نازانم..

*** لەو سەیارەیەی تۆی تێدابووی کەسێکی تری تیابوو کە تۆ بیناسی..؟**

- ئامۆزاکەم و کورێکی تریش ناوی(ئەدیب کوری شێخ حەکیم فەیم تاڵەبانی) بوو خەڵکی بنار گل بوو لەگەڵ مندا پێکەوە لە سەیارەیەکدا بووین..

*** سەیارەی چەند کەسیان تێکرد..؟**

- سەیارەکە کورسیەکانی وەك کورسی دواوەی تویێتا وابوو ریز ریز بوو نەفەرەکان پشتمان ئەدا بەیەکتریدا، نازانم چەند ریز کورسی بوو بەلام هەر سەیارەی(٥٠ بۆ ٦٠)کەسیان تێ ئەکرد..

*** ئەو(٥٠ بۆ ٦٠) کەسە پێکەوە لەیەك سەیارەدا بوون کەسیان هەبوو بڵێ من جاری تر لەم سەیارەیەم بینیوە..؟**

- لـه ڕێگـه لەناوخۆمانـدا قسـەمان دەکـرد زۆر باسـی ئـەم جـۆره سەیارەیەمان کرد گشتی ئـەیووت پێشـتر لـەم سـەیارەیەم لـە عێـراق دا نەبینیوه.. لەوه ئەچوو له وڵاتی ترەوه هێنابێتیان

*** تەماشای ژمارەی سەیارەکەتان نەکرد..؟**

- نەء

*** ئەتوانی پێم بڵێی ئەوکاتەی تۆ سواری سەیارەکە کرای کەی بوو..؟**

- کاتژمێر ١٠,٣٠ بوو

*** پێشتر ووتت سەعات ٩,٣٠ سەیارەکەیان هێنا..!؟**

- ئێئێ وابوو سەعات ٩,٣٠ سەیارەیان هێنا بەڵام بەناو خوێندنـەوه بوو تا ناوەکەت بەری دەکەوت و باردەکرای و ئەو سەیارەیه پـڕ دەبوو دەڕۆی و لەو لاترەوه ئەوەستا و یەکێکی تر ئەهاته شوێنی ئەو تا ئـەو پڕ ئەکرا و بەم شێوەیه کاتێ نۆرەی من هات کات گەیشتبووه ١٠,٣٠

*** خـەڵکی تـر دوای تـۆ مـابوون لـه قاعەکـەدا و چـاوەڕێ بـن ناویـان بخوێندرێتەوه..؟**

- بەڵێ مابوو.. خەڵکیش مابوو سەیارەی بەتاڵیش مابوو..

*** سەیارەکە پەنجەرەی تیابوو..؟**

- پەنجەرەی چی، بەخوا کونێکی تیانەبوو بۆ نەفەسیش..

*** کەواتە ئەوکاتەی سەر خران ئیتر ئاگاتان له دەرەوه نەما..؟**

چونکه هەمووی قەپات بوو کورسیەکانیش وابوون پشتمان کردبـۆ یەکتری هەر نەمان ئەزانی بەرەو خوار ئەڕوات یان بەرەو ژور..

*** کاتێ خستتانیانه سەیارەکانەوه دەست و چاویان نەبەستن..؟**

لەوێ نەیان بەست بەڵام لەدیار چاڵی گوللەباران کردنەکه و پـێش ئـەوەی رەمیمـان بکـەن چـاومانیان دەبەسـت و دوو دوو دەسـتمانیان دەبەسته یەکتریەوه..

*** دوای ئەوەی سواری سەیارەکان کران هەست دەکەی چەنێکی تری پێچوو تا سەیارەکان کەوتنە رێ..؟**

وا هەست دەکەم کە نیو سەعات بوبێ.

*** کاتێ کەوتنە رێ بەسەر جادەی قیردا بردتانیان یان رێگای خۆڵ..؟**

لە تۆپزاواوە بەسەر قیردا بردمانیان تا رەنگە هەر نیو سەعات دوور لە شوێنی گوللەباران کردنەکەمان ، ئەو نیو سەعاتە بەرێگای خۆڵ و زۆر چاڵ و چۆڵیدا ئەرۆیشت چونکە بە تاسەکانی دیاربوو ئەمانزانی کە رێگاکە چۆن بوو..

*** سایەقی سەیارەکە سەرباز بوو یان مەدەنی..؟**

نازانم چونکە کاتێ ئێمەیان بارکرد هەر لەناو دەرگای قاعەکەوە بۆ دەرگای سەیارەکە و سەرباز دەورمانی گرتبوو دوو سەربازی تریش باڵمانی دەگرت و بۆ ناو سەیارەکە.. کاتێ سواریش بووین سەیارەکە شۆفێرەکەی لە ئێمەوە دیار نەبوو..چونکە سەیارەکە لەنێوان ئێمەو شۆفێرەکەدا(خانێکی) هەبوو وەك هۆڵێکی جیاواز لە نێوان ئێمەو شۆفێرەکەشدا.. سەربازێك لەو(خانە جیاوازە) سوار بووبوو..

*** هیچ قسەیەکتان لەگەڵ سەربازەکەدا نەکرد..؟**

ناڵێم ئەویش خانێکی جیاواز بوو لە ئێمە.. ئێمە تەنها ئەوکاتەی سەرخراین و ئەوکاتەی داگیراین بەو خانەدا رۆیشتین.. سەربازەکە لەوێ دانیشتبوو..

*** کاتێ سەیارەکان کەوتنە رێ، یاخود کە سەیارەکەتان کەوتە رێ هەستت بەوە کرد کە قافڵەی سەیارەکان هەموو پێکەوەن..؟**

- وەڵایی کە ئێمە چوینە سەیارەکەوە ئیتر وەك کوێر وابوین هیچ شوێنێکمان لێوە دیارنەبوو بەڵام ئەمانزانی کە هەموو قافڵەکە پێکەوەین..

*** بەچی ئەتانزانی..؟**

- بەوە ئەمانزانی ئەوکاتەی کە هەر سەیارەیەك پڕ ئەکرا ئەچوە ریزەوە و چاوەڕێی ئەوەی ئەکرد کە سەیارەکانی تر پڕبن..

*** بەر لەوەی سوارتان کەن هیچ نان و ئاوێکیان دا پێتان..!؟**

- نان و ئاوی چی ..!

*** کاتێ ئاوا بینیت کە خرانە سەیارەی(موقەپەتەوە ) پێت وابوو بۆکوێ تان ئەبەن.. یا چیتان لێ دەکەن..؟**

- بەخوا من هەر لەناو لیواکەی چەمچەماڵدا کاتێ یەکەم شت شەرواڵی ژنی کوردم بە چەنچی عەرەبانە و ئیڤای عەسکەریەوە بینی هەر ئەوکاتە وتم تەواو ئیتر چاومان بەدنیای رۆشن ناکەوێتەوە.. ئەوە کۆتایی هەموو شتێ بوو..بەلاّم ئەڵێی چی روح لە جێی سەختە و دەرناچێ، مردنیش بەدەست خۆت نیە تا هەر ئەوکاتە بڵێی بمرم و رزگارم بێت.. من لەوێ حاڵی بووم کە رۆژەکە گەلێ رەشە، بەلاّم مرۆڤ بەدەستی خۆی نیە ناتوانێت بێ ئومێدبێت لە ژیان بۆیە سەرباری ئەوەی کە قەناعەتی تەواوم هەبوو کەئەم حکومەتە زاڵمە هەمومان ئەکوژێ بەلاّم هەر بەتەمای ژیانیش بووم چی لەناو قاعەکانی تۆپزاوا ئەوکاتەی لە پەنجەرەکانەوە چاوم بەناو ئەو ژن و منالاّنەدا ئەگێڕا و ژن و منالّەکانی خۆمم بیر ئەکەوتەوە کە بیریانم ئەکرد و چی ئەوکاتەی خراینە سەیارەی سەر داپۆشراوەوە کە بۆ ئێمە وەك(تابوت)وابوو چۆن مرۆڤ کە ئەمرێ ئەیخەنە ناو تابوتەوە تا گۆڕستان ئەو سەیارانەش بۆ ئێمە وەك ئەو تابوتە وابوو خستمانیانە ناویەوە تا دیار چاڵەکانی مەرگ شوێنی گوللەباران کردنەکەمان.. بەردەوام لەوماوەیەشدا بەخەیاڵ لەگەڵ ژن و منالّ و کەس و کارمدا ئەژیام.. چونکە زۆرجاریش ئەوەم بیستبوو کە بەر لەمردن وێنەی

کەس و کارت دێنە پێش چاوت.. ئیتر منیش چونکە بڕوام بەوە نەبوو کە ئازادمان بکەن و دام نابوو کە بۆ مردنمان دەبەن بۆیە زوو زوو وێنەی کەس و کارم وێنەی کەس و کارە مردوەکانیشم ئەهاتەوە بەرچاو..

*** لەناو سەیارەکە لەگەڵ ئامۆزاکەت و نەفەرەکانی تر(زیندانیەکانی تر) پێکەوە قسەتان ئەکرد..؟**

- ئا قسەمان ئەکرد..

*** تۆ پێت ئەوتن کە بڕوا ناکەی ئازاد بکرێن و ڕەنگە هەموتان بکوژن..؟**

- با، وام ئەووت، ئەمووت گشتمان ڕەمی ئەکەن

*** ئەوان چیان ئەوت..؟**

- پێمیان ئەوت تۆ ترسنۆکی..

*** تۆ هەستت بە ترس ئەکرد، کاتێ ئاوا دڕندانە لەگەڵتان مامەڵەیان دەکرد و بۆ خۆشت قەناعەتت وابوو گوللەبارانتان ئەکەن..؟!**

- وەڵایی وەك ترس ناترسام بەڵام زۆرم پێناخۆش بوو کە بەو دەردە چوبوین خەفەتم پێ ئەخوارد کە ئەو هەموو خەڵکە ئەو هەموو ژن و منداڵە گوناهیان چیە وامان لێ ئەکەن.. ئاخر وای دانێ هەموو زەلام و ژنەکان تاوانبارن ئەی ئەو هەموو منداڵە تاوانی چی بوو، بەخوا چەندین ژنم بینی منداڵە قنۆرەکە بە باوشیەوە بوو هەبوو تەمەنی پێنج شەش ڕۆژ بوو کورە هەبوو کە لە دێیەکەدا سواری زیلی عەسکەریان کردبوو لەناو زیلی عەسکەری لەدایك ببو ئاخر ئەوان گوناهیان چی بوو.. نازانم ئەوکاتەش و تائێستاش کە بیر لەوانە دەکەمەوە تێناگەم ئەم سەدامە زاڵمە لەپای چی وای بەو خەڵکە کرد.. چۆن ویژدانیان ڕێگەی داون منالی سێ ڕۆژە بکوژن، نازانم ناترسام بەڵام زۆرم بە زەیی بە خۆماندا ئەهاتەوە..

*** کەسی تر هەبوو قەناعەتی وەك تۆ وابوبیٚ کـە بـۆ گوللـەباران کـردن ئەتانبەن..!؟**

هەر یەکە و قسەیەکی ئەکرد.. هەبوو ئەیوت ئەمانبەن بۆ بەغـدا لـەویٚ بـەرمان ئـەدەن.. هـەبوو ئـەیووت ئەمانبـەن ئەمانکـەن بـە عەسکەر.. هەبوو ئەیووت گشتمان ئەبەن بۆ ولاٌتانی تر و ئیشمان پیٚ ئەکـەن.. هەیشـبوو ئەترسا و بـیری کـەس و کارەکـەی وای لیٚکردبـوو ئەگریا و ئەیوت ئەمانکوژن ومەیتەکانیشمان نادەنـەوە کـەس وکارمـان و هەتا هەتایە ئەبیٚ ئـەوان هـەر چاوەرِیٚ بـن کـە بگەرِیٚینـەوە هـەبوو ئـەیوت گشـتمان ئەخەنـە بـەحرەوە و ماسـی و گیانلەبـەری نـاو ئـاو ئەمانخوات.. هەیشبوو بەتەمای بەردان بوو..

*** هەستت بەچی دەکرد کەوا ئەتزانی ئەو سەیارەیە بـەرەو پـیری مـەرگ ئەتانبات.. سات لەدوای سات زیاتر دلٌتەنگ تر و نائومیٚد تر نەدەبووی..؟**

- لەناو ئەو سەیارەیە کە هەر موقەپەتیەکەی وەك تـەعزیب وابـوو هـەوا کیٚشـیٚکی نـەبوو خۆیشـمان هـەتا دەبـوو زیـاتر گـەرمامان دەبـوو زیاتر تینـوو دەبـوین و برسـیمان دەبـوو.. تەنگـە نەفـەس ئـەبوین کـە ئەگـەر نـەك بـۆ گوللـەباران کـردن بیـان ووتایـە وابـۆ ئازادکردنیشـتان ئەبەین ناو ئەو سەیارەیە هـەر بۆخـۆی مایـەی عـەزاب بـوو.. بروابکـە وەك ئەوە وابوو لە تەنووری ئاگردابی و دەقە لەدوای دەقە هەستت بە گـەرمای زیـاتر و تەنگـە نەفەسـی زیـاتر و تینـویٚتی زیـاتر دەکـرد.. هـەمومان قورِگمــان وشـك ببـوو هـەر بـە ئاسـتەم هەناسـەمان پــیٚ ئـەدرا..زۆر کەسـیش کـە تـەنگاو بـوو میـزوو پیسـیەکەی کردبـۆ نـاو سەیارەکە، هەر خەریك بوو بمانکوژیٚ..!

*** ئەوانـەی لـەناو ئەوسـەیارەیەدا پیٚکـەوە بـوون نـازانی خـەلٌکی چـی ناوچەیەکی تیابوو..؟**

بەزۆری خەڵکی لای سەنگاو و ناو زەنگەنە و قادر کەرەم بوون

*** تەمەنی هەموتان نزیك بوو لەیەکتریەوە.. چونکە ئێوە لە تۆپزاوا بە حیسابی ئەوەی گەنجن جیاکرابونەوە..؟**

نەوەڵا.. هەمومان تەمەنمان لەیەکەوە نزیك نەبوو.. لە توپزاوا کە گەنجەکانیان جیاکردەوە لە گەنجی(١٥)ساڵەوە تا(٥٠) پەنجا ساڵ هەر حیساب گەنجیان بۆ دەکرد.. ئەو سەیارەیەی ئێمەش دوو کوڕی گەنجی تیابوو مویان لێ نەهاتبوو هەر زۆر مناڵبوون هەر سەریان کردبوو بەیەکدا لەوە ئەچوو خزم و کەسی یەکتریش بوبن زۆر ئەترسان و کابرایەکیشی تیابوو کامڵیش بوو هەر ئەگریا و ئەیووت من خۆم وام لەخۆم کرد لای موستەشارێك بوم وتویەتی بڕۆ عیلاجی خۆت بکە من ناتوانم داڵدەت بدەم.. بەملی شکاوم هاتم تەسلیم بووم.. لەسەرنی ئەو وەزعەی خۆمەوە زۆرم بەزەیی بەو دوو کوڕە مناڵە و بەو کابرایەدا ئەهاتەوە.. زۆر بەزەیم بەکابرایەکی تریشدا ئەهاتەوە کە تینوێتی تەنگی پێ هەڵچنیبوو هەر ئەپاڕایەوە هاواری بوو ئەیوت خنکام فریام کەون قومێ ئاو..ئێ ئێمەش هەمومان هەر وەك ئەو وابوین ، بینیم پێڵاوەکانی لەپێی خۆی داکەند و میزەکەی خۆی تێکرد و لە تینوا خواردیەوە.. ئەو دیمەنەش زۆر ئازاری دام

*** سەیارەکان لە رێگە نەوەستان.. یا هەست بکەی لابدەن بۆناو سەربازگەیەك..؟**

- ئێمە لەناوەوەی سەیارەکە ئاگامان لەدەرەوەی سەیارەکە نەبوو نەشمان ئەزانی روەو کوێ ئەچێ.. بەڵام لە شوێنێك کەمێك راوەستا نازانم هۆی چیبوو ئێمە وامان دانا کە رەنگە بەنزینخانە بێت و بەنزینی تێبکەن..

*** ماوەی چەنێ بەرێگاوە بوون تا گەیاندتانیانە شوێنی گوللەباران کردنەکە..؟**

- نازانم چەند سەعات ئەکات لە چێشتەنگاوەوە لە توپزاوا خستمانیانە رێ هەرووا چارەکێ بۆ نیوسەعات خۆری مابوو کە گەیشینە ئەو شوێنەی رەمیمانیان کرد..

*** سەیارەکان لە رێگا خێرا ئەڕۆیشتن..؟**

ئەرێ وەڵا ئەتوت تەنها لەبەر ئەوە وا لێ ئەخوڕن کە ئێمە ئازار بچێژین.. چونکە ناو سەیارەکە گەرم و تەنگە نەفەس بوو خۆیشمان تینو و برسی کە لە تاسەیەکی ئەدا وەختبوو روح و دڵمان دەرچێ سەرمان گێژی ئەخوارد.. جاری وابوو وا هەستمان ئەکرد بە ئاسماندا بڕوات ئەوەنە خێرا ئەڕۆیی دیاربوو پەلەی ئەوەیان بوو کە زوو ئێمە بگەێننە شوێنی مردنەکەمان و بگەڕێنەوە وەجبەی تر بەرن..

*** تا ئەو شوێنەی کە بۆ مەرگی ئەو هەزاران گەنجە کوردە ئامادە کرابوو لە توپزاواوە بۆ ئەوێ بەسەر جادەی قیردا ڕۆیشتن..؟**

هەمووی قیربووتەنها بەمەزەنە بیست دەقە بۆ نیوسەعات بەسەر خۆڵدا رۆیشتین..

*** کاتێ لەجادەی قیر لای دا و چووە سەر خۆڵ هەستتان پێ کرد..؟**

- سەیارەکە وردە وردە خاوی کردەوە سەرەتا وامانزانی رائەوەستن هەستمان پێکرد کە ئاراستەکەیشی گۆڕی و چوە سەر رێگای خۆڵ چونکە تاسەی گەلێ زۆر بوو دیاربوو رێگاکە چاڵ و چۆڵی بوو ئەو ماوەیەی بەسەر ئەو رێگایەدا چوو بەقەدەر هەموو رێگاکە سەغڵەتیمان بینی وەك بێشکە رامانی ئەژەن سەرمان ئەیدا بەیەکدا، هەبوو لەتاوا ئەکەوت ئیڵنجیان ئەدا..

*** بەر لەوەی بگەنە شوێنی گوللەبارانکردنەکە لەو ماوەیەی بەسەر ڕێگای خۆڵدا ئەڕۆیشتن جگە لەوەی کە خۆتان بڕواتان وابوو ئەتان کوژن هەستتان بەهیچ ئاماژەیەکی تر نەکرد کە لە مەرگ نزیك ئەبنەوە..؟**

- دە دەقیقە ئەبوو بەسەر خۆڵدا ئەڕۆیشتین دەنگی تەقە کردن ئەهات تەقەیەکی زۆر بەلام ئێمەوامان ئەزانی تەقەتەقی سەیارەکانە چونکە ڕێگاکە تاسەی زۆر بوو ، سەرەتا وامان لێك ئەدایەوە بەلام تا ئێمە زیاتر ئەڕۆیشتین زۆرتر دەنگی تەقە ئەهات ئەوکاتە نەمانزانی چیە بەلام دواتر بۆم دەرکەوت کە هەموو ئەو تەقە کردنانە تەقەی گوللەبارانکردنی کورد بوو..

*** کەواتە سەیارەکانی پێشەوە ئەوانەی هاوسەفەرەکانی تۆیان بارکردبوو ئەوانیان داگرتبوو گوللەباران دەکران..؟!**

- نەخێر.. ئەو تەقانە گوللەباران کردنی قافڵەکەی ئێمە نەبوو ئێمە دەور چارەکە سەعاتێ بە شوێنێکدا بردمانیان خەڵکی تر لەوێ ڕەمی دەکرا.. سەیارەکانی ئێمە بەناویاندا تێ ئەپەڕی و ئەوان هەر لەسەر تەقەکردنی خۆیان بەردەوام بوون..

*** ماوەی چەنێ سەیارەکان ڕێگایان کرد و هەر گوێتان لەتەقە بوو..؟**

- ئەی نەموت نزیکەی چارەکە سەعاتێ..

*** کەواتە ئێوە بەسەیارە بەدرێژایی چارەکە سەعاتێ ڕێگاتان بڕی و بە درێژایی ئەو ماوەیە خەڵك گوللەباران ئەکرا..!؟**

- ئەوکاتەی تەقەکان ئەکرا ئێمە نەمانزانی کە خەڵك ڕەمی ئەکەن.. من دوایی ئەوانەم بۆ دەرکەوت کە چەنێ گەنجی کوردیان خستبووە ئەو چاڵانەوە.. کە هەر چاڵێکی بە باڵای زەلام پڕ کرابوو لەلاشەی لەسەر یەك..

*** ئەو حاڵەتت لەیاد ماوە کە سەیارەکان چۆن راوەستان و چۆن ئێوەیـان داگرتە خوارەوە بۆ گوللەباران کردن..؟**

- بەڵێ لەبیرم ماوە و لەبەرچاومە و هەتا ئـەو رۆژەی لـوتم ئـەدا لـە بەردی ئەلحەد لەبیرم ناچێتەوە.

*** زۆر داوای لێبوردن ئەکەم رەنگە بەیاد خستنەوەی ئەو حاڵەتانە ئـازاری دەرونیـت بـدەم.. بـەڵام بـۆ مێـژووی نەتەوەکـەمان زۆر پێویسـتە بـە وردی هەموویان تۆمار بکەین بۆیە داوات لێدەکەم کە بە وردی بۆمی بگێڕیتەوە..!؟**

- ئـەوەی مـن بینـیم و بەسـەرمانا هـات هـی گێڕانـەوە نیـە.. بـڕوا ئەکـەی لـە ١٩٨٨ وە تـا ئـەو رۆژەی بـەرەو ئـەمریکا ئەچـوین لـەناو سـەفارەتی ئـەمریکا لـە تورکیـا لـەوێ بـۆ ژن و منداڵـەکانم گێڕاوەتـەوە ئەویش دوای زیاتر لە (٩) ساڵ بەسەریدا تێپـەری بـوو.. حـەزم نـاکرد ئەوەی من بینیبووم لەچاوی منەوە کەسی تر بیبینێ..!

*** کاك فەرەج من سەرەتا بەر لەوەی دیدارەکەمان دەسـت پێبکـەین زۆر باسم بۆ کردی کە بە گێڕانەوەی ئەوەی لەو کارەساتەدا بەسـەرت هـاتووە.. چی خزمەتێکی گەورە بە کورد دەکـەیت.. راسـتە بیرخسـتنەوەیان ئـازارت ئەدات بەڵام ناشکرێ تۆ لەگەڵ خۆتدا ئەو هەموو زانیاریە بەریتـە گـۆڕەوە.. میللەتەکەت پێویستی بەو زانیاریانە هەیە.. من پێم وتی خوا ئێوەی بـۆ ئـەوە بە زیندوێتی هێشتەوە تا روداوەکە بگێڕنەوە.. بۆیە تکات لێدەم بۆمی بـاس بکە.. چۆن لە سەیارەکان داتانیان گرت..؟**

- وەك ووتم دەنگـی تەقـە ئـەهات کـە خـەڵکی تـر رەمـی دەکـران دیاربوو ئەو شوێنە هەمووی ئامادە کرابوو بۆ گوللەباران کردنی ئێمـە و پێش ئێمەش خەڵکی تریـان بـۆ بردبـوو.. کـە سـەیارەکان راوەسـتان هەر دەنگی دەستڕێژی گوللە ئـەهات.. ئـیتر هـەموومان ئەوانـەی لـەناو سـەیارەکە بـوین واقمـان وڕمـابوو هـیچ قسـەیەکمان بـۆ نـاکرا تـەنها

تەماشای یەکتریمان دەکرد.. ئەوەی کە پێشتر لەترسا نەگریا هەمووی بێ دەنگ بوون وەك ئەوەی ماڵ ئاوایی لەیەکتر بکەین بەچاو هەموو قسەیەکمان ئەکرد.. ئەمانزانی وا پاش کەمێکی تر بە ناهەقی گوللەبارانمان ئەکەن.. ئەمانزانی ئەو تەقە کردنەش ئەو گوللانە ئەنرێنە برا و کەس و کاری ئێمەوە.. ماوەی(٥) دەقە ئێمە هەر لەناو سەیارەکە بووین و دەرگایان لەسەرمان نەکردەوە و چاوەڕێ بووین نۆرەمان بێت تا بمانبەن گوللەبارانمان بکەن.. وەك سەرەتا باسم کرد سەیارەکان لە نێوان ئێمە و شۆفێرەکەدا خانێکی هەبوو وەك هۆڵ وابوو دەرگایەکی هەبوو لەلا تەنیشتەوە لەوێوە سوار کراین ئەو دەرگایە کرایەوە و دەرگاکەی ئێمەشیان کردەوە و دوو سەرباز هاتنە ناو ئەو(خانەی نێوان ئێمە و شۆفێرەکە) دوو کەسیان لە سەیارەکەی ئێمە بردە ئەو دیودا و دایان گرتە خوارەوە چاوم لێبوو کە بە جامانەکەیان چاویانیان بەست و بە پشتوێنەکەیان لە پشتەوە دەستی هەردوکیانیان بەستەوە و دوو سەرباز بردیانیانە پێشتر و لەسەر دەم پاڵیانیان خست و دەستڕێژی گوللە کرا.. ئەوە بە بەرچاوی ئێمەوە بووئیتر دڵنیا بوین پاش چەند چرکەیەکی تر هەمومان ئاوا بەڕیز و بەدوای یەکتریدا رەمی دەکرێین..

*** ئەو کاتەی دەرگاتان لەسەر کرایەوە.. یەکەم دیمەن بەرچاوت کەوت چی بوو..؟**

- دوو سەرباز..

*** جلەکانیان چۆن بوو..؟**

- سەوز بوو..

*** سەرشانیان ئامازەی ئەوەی پێوەبوو کە پلەدارن..؟**

- نەء

*** چەکەکانیان چی بوو..؟**

کلاشینکۆف

*** مەخزەنەکەی ..؟**

- مەخزەنەکەی چی ..؟!

*** جۆری مەخزەنی کلاشینکۆفەکانیان چی بوو(٧٥)ی بوو(٤٠)ی بوو یان (٣٠)یی..!؟**

- مەخزەنی(٣٠)یی لەسەر بوو بەلام ئاسن نەبوو داری قاوەیی بوو مەخزەنی پلاستیکی بوو.

*** سەربازەکان رەنگیان چۆن بوو مەبەستم شێوەیانە..؟**

- نازانم، لەبەرچاو ئێمە ناشرینترین و درندەترین و ترسناکترین شت بوون.

*** بەر لەوەی نۆرەی تۆ بێت بۆ گوللەباران کردن چەند کەسی تریان لەسەیارەکەی ئێوە داگرتە خوارەوە و گوللەباران کران..؟!**

- هەشت کەس..

*** ئەی ئەو کاتەی وا لە سەیارەکەی ئێوەدا بۆ گوللە بارانکردن پەلکێشتانیان کرد سەیارەکانی تر لەکوێ بوون.. لە ریزدا وەستابوون تا نۆرەیان بەرکەوێ ..؟**

- نەخێر وەك رۆژی حەشر وابوو لەچەند لایەکەوەهەر زرمە ئەهات و لە هەموو لایەکەوە گوێت لە دەنگی دەستڕێژی گوللە بوو.. سەیارەکانی تریش کە لەگەڵ قافڵەکەی ئێمەدا پێکەوە بوین هەریەکە لەلایەکە وەستێنرابوو لە دیار چاڵەکان و دەستەی گوللە بارانکردن خەریکی رەمی کردنیان بوون..

*** لە سەیارەکە دوو دوو دایان ئەگرتن..!؟**

بەڵێ دوو کەس دووکەس پێکەوە دا ئەگیراین و دەستمان پێکەوە ئەبەسترا پێکەوە گوللە باران ئەکراین و پێکەوە فڕێ ئەدراینە ناو گۆڕە بە کۆمەڵەکانەوە..

*** کاری داگرتن و دەست و چاو بەستنەوە و گولە بارانکردنی دووکەس چەنێ کاتی پێویست بوو تا نۆرەی دوانی تر ئەهات..!؟**

- وەڵایی خۆی ئەوان بە(١٠)کەسەوە ئەیانتوانی لە(٥) دەقەدا هەزار کەس بکوژن ئەیانتوانی گشتمان دابگرنە خوارەوە هەمومان بکەنە ناو چاڵەکەوە و لە هەموو لایەکەوە دەسترێژمان لێبکەن تا هەموومان تەواو دەبووین.. بەڵام من قەناعەتم وایە کەبۆیە بەو شێوەیە گوللە بارانمانیان دەکرد تا زۆرترین ئازار بچێژین.. راستە ئازاری هەموو گولله بارانکردنێك یەك ئازارە، بەڵام تۆ لەکوێ لە حاڵەتی وادا لە چرکە ساتێکدا کۆتایت بێت و رزگارت بێ، لەکوێ بە بەرچاوتەوە یەکە یەکە بیکوژن و تۆش نۆرەت بۆی گرتبێ.. هەر دەقیقەیەکی ئەو چاوەڕوانیە ئازاری دەیان ساڵ ناخۆشی تەمەنت هەیە.. دەوەرە تۆ سەعاتێك تەماشای ئەو دیمەنانە بکە بزانە هەموو لەحزەی چاو تروکانێکی ئازاری مردنێك نیە..؟

*** وەڵامی پرسیارەکەمت نەدایەوە کە تا دووکەسیان گولله باران دەکرد و دەگەڕایەوە بۆ دوانی تر چەنێکی پێ ئەچوو..؟**

- ئا، زۆری ئەبرد.. چونکە کە دوو کەسیان لەسەیارەکە دائەگرد هەموو لەشیان ئەگەڕان لە پێیانەوە تا ناو کلاّوو جامانەکەشی بە وردی ئەیانپشکنی ئەگەر شتت لە گیرفان هەبوایە زووتر لە پشکنیکە دەبوونەوە چونکە دەریان دەهێنا و ئیتر ئەوەندە نەدەگەڕان.. بەڵام گەر کەسێك هیچی پێ نەبوایە زۆر بە وردی ئەگەڕان وایان ئەزانی کە لە شوێنی تردا شاردویەتیەوە. دوای ئەو پشکنینە پشتوێنەکەی و

جامانەکـەیان لێ ئـەکردەوە و چـاوی هـەردوکیان دەبەسـت و بـە پشتوێنەکە لە پشتەوە دەستی هەردوکیانیان دەبەستەوە.. هەروا پێنج مەتر لە سـەیارەکە ئـەتیان بـردە پێشـەوە چاڵەکان ئامـادە کرابـوون و لەسەردەم هەردووکیان پاڵدەخست و پێتیان ئـەووت(شایەتمان)بێنـە و دوای ئـەوە تـۆ شایەتمانت دەهێنـا هـەردوو سـەربازەکەش بـە عـەرەبی شـتێکیان دەخوێنـد نـازانم وەك ئایـەت وابـوو ئـەوجا هـەردوکیان دەسـترێژیان لێ دەکـردی و تاوێـك بـە دیارتـەوە رادەوەسـتان دواتـر تەرمـەکانیان رادەکێشایە لێـواری چاڵەکە کـە شـۆفڵ بەدرێـژی هـەڵی کەندبوو بە باڵای زەلام زیاتر قوڵی کردبوو لەو لێـوارەوە تەرمـەکانیان بەر ئەدایەوە ئەوسا ئـەهاتن بەشـوێن دوانـی تـردا بۆیـە مـاوەی گوللە بارانکردنەکە زۆری پێدەچوو کە هەست ئەکەم تەنها بـە ئـارەزوو ئـاوا لەسەر خۆیان خەڵکەکەیان دەکوشت کە گەورەترین عـەزابی روحیمـان بوو.. هـەمووومان حـەزمان ئـەکرد لەیـەك چرکەدا بمـانکوژن و زوڵمـی زیاتر نەبینین..

*** ئەگەر لێت بپرسم لەسەرجەم ئەو دیمەنانەدا کە بە گێڕانەوەشیان مـرۆڤ موچورکە بەگیانیدا دێت چ جای ئەوەی بە بەرچاوتەوە رووبدەن.. لەناو ئـەو دیمەنانەدا کامیان لە هەمووی زیاتر ئازاری داوی..!؟**

- لـەناو سـەیارەکەی ئێمـەدا دوو کـوڕی مێـرد منـاڵی تیـابوو.. دوو گەنجی زۆر جوان و سـەرنـج راکێش بـوون کـە مـرۆڤ هەرچـەندە زاڵـم بێت و ئەم دوو گەنجـە دووژمنیشـت بـن دەسـتت تێناچـوو بیـانکوژی.. لەناو سەیارەکە لەپێش من و ئامۆزاکەمـەوە دانیشـتبوون دوای ئـەوەی کە ووتم هەشـت کەسـیان بـرد بـۆ گوللـە بـاران کـردن، نۆیـەم و دەیـەم کەس ئەو دووگەنجە جوانـە بـوون کـاتێ کـە ئـەیانزانی ئـەم جـارە کـە سـەربازەکان گەڕانـەوە نـۆرەی ئەوانـە خۆیـان ئەنووسـان بەسـەر ئـەو

تەختەیەوە کە لەسەری دانیشتبوون و هەڵ ئەلەرزین رەنگیان نوری لێ ئەباری، نەم ئەتوانی تەماشایان بکەم.. کە سەیرم ئەکردن هەستم ئەکرد ئەمەوێ هەتا ئەتوانم هاوار بۆ خوا بکەم..لەتاوا هەر ئەپاڕامەوە و ئایەتولکورسیم ئەخوێند.. ئەمبینی لەگەڵ هەر هەناسەدانێکدا هەناسەیان کورت تر دەبوو.. دەستی ئامۆزاکەمم گرت و ووتم با ئێمە لە پێش ئەم دوو گەنجەدا بمرین.. توخوا با مەرگی ئەم دوانە نەبینم بەزۆر پەلی(صالح)ی ئامۆزامم راکێشا و هاتینە پێشیانەوە.. ئەمجارە کە تەماشایانم کرد هەستم کرد لە سیمایاندا خۆشحالێیم بەدی دەکرد دیاربوو زۆر بەوە دڵخۆش بوون کە مەرگیان چەند دەقیقەیەك دوا ئەکەوێت، لەوە ئەچوو هەر بەئومێدی ئەوە بوبن کە خوا دەگاتە فریایان و ئاوا بە رەزیلی نامرن.. کە دوو سەربازە جەلادەکە گەڕانەوە من و صالح لەبەردەمیاندا ئامادەبوین بۆ مەرگ و توند هەر یەکێ کردیان بە قۆڵی یەکێکماندا و دامانیان گرتە خوارەوە.

*** ئەوکاتانەی کە دووکەسیان ئەبرد بۆ گوللە بارانکردن تا ئەگەڕانەوە بۆ دوانی تر کەس هەبوو پاسەوانیتان بکات..؟**

- ئا، دوو سەربازی تر بە تفەنگەوە لەناو ئەو خانەیەی سەیارەکەدا بەرەوو روومان وەستابوون..

*** لەوکاتەدا کە ئامادەبیت تیابوو نۆرە برِی لەگەڵ دوو گەنجەکەدا بکەی بۆ مەرگ تا مەرگی ئەوان نەبینی هەستت بەچی کرد..!؟**

- سەرەتا وا هەستم ئەکرد کە بەوەی گیانی خۆم ببەخشم گیانی ئەو دوو گەنجە رزگار ئەکەم.. بەلام ئەوەی من ئەمویست بەچاوی خۆم نەیبینم ئاخری هەر بینیم..

*** تۆ و صاڵحی ئامۆزات کامتـان لـەپێش ئـەوی ترتانـەوە لـە سـەیارەکە دابەزین..؟**

- من..

*** یەکەم دیمەن لەدوای ئەوەی دایانگرتن بینیت و سەرنجی راکێشـایت چی بوو..؟**

- کـە دامیـان گـرد سـەرباری ئـەوەی کـە هـەنگاو بـە هـەنگاو بـەرەو مەرگ ئەچووم بەڵام ئەوەندە لەناو سەیارەکە تەنگە نەفـەس ببـووم و ئەوەندە خۆزگەم خواستبوو یەك جارێ تررووناکی دەرەوە ببیـنم، دڵـم بـەو ساتە خـۆش بـوو کـە رونـاکیم بینـی و چاوم بـەزەوی کەوتـەوە.. لەوساتە کەمەی کە لە سەیارەکە دامیان گرت و تا ئەوکاتـەی چاومیان بەستەوەزۆر شتـم بینی و زۆر شت سەرنجی راکێشام چاڵی درێژ درێـژم بینی شۆفلّم بینـی.. سەربازی زۆرم بینـی.. جەنازەی زۆرم بینـی

*** ئەتوانی بە تەئکید پێم بڵێی کەی بوو ئەو ساتەی کە چاویان بەستیتەوە بۆ گوللەبارانکردن..؟**

- خۆر ئاوا بووبوو خەریك بوو تاریك دائەهات..

*** رۆژەکەی نازانی چەند شەم بوو..؟**

- نـەوەڵا..

*** ئەی مێژووی رۆژەکە چەنی مانگی چواری هەشتاو هەشت بوو..؟**

- نازانم چەنـی مانگ بوو بـەڵام دوو شـەو و سـێ رۆژ بـوو لـە (چـەم ئالیاوا) بارکرابوین گەیاندمانیانە ئـەو شـوێنەی وا تیایـدا ئـەو هـەموو گەنجە کوردەیان رەمی کرد..

*** ئەوکاتانەی کەچاویان دەبەستی تەماشای سەربازەکەت نەکرد.. بزانی لە چاویدا چی دەخوێنیتەوە..؟**

- ئەوان كە قۆڵی ئێمەیان گرتبوو یەكسەر لەدواوە دەستمانیان بەست و هەر لەدواوە توند چاومانیان بەست من پشتم لێی بوو..

*** دوا دیمەن بینیت بەر لەوەی چاوت ببەستن ..!؟**

- لایتی شۆفڵەكە بوو كە لە دوورەوە ئیشی ئەكرد..

*** ناسنامە و كەل و پەلی گیرفانتان دوای ئەوەی دەستانیان بەست بردیان..؟**

- بەڵێ.. دوای ئەوەی دەست و چاومانیان بەست گیانمان گەڕان، من جنسیە و پارەی زۆرم پێبوو ئەوەی لە گیرفانەكانم بوو دەریان هێنا و چونكە لە گیرفانم دا بوو ئیتر زۆر نەگەڕان بەڵام پێش ئەوەی بمانبەن بۆ تۆپزاوە هەندێ پارەم لەناو(دەرپێ كولەكەم) شاردەوە لەوێ نەیاندۆزیەوە و ئەو پارەیەم پێ مایەوە..

*** دوای ئەوەی پشكنین تەواو بوو ئیتر تەواو دڵنیابووی كە لەچەند چركەیەكی تردا ئەمری باری دەرونی و ئەوەی بە خەیاڵت دا ئەهات چی بوو..؟**

- لەوكاتەدا ئەوەی بەخەیاڵم دا ئەهات خوێندنی ئایەتولورسی بوو.. مەولویەكیشم قەولدا كە ئەگەر رزگارم بێ(گوێلك)ێك ئەكەمە خێر..ئیتر نازانم چۆن باسی بكەم بڕوا بكە رەنگە بڵێم لەیەك دەقەدا هەزار دیمەن هاتە بەرچاوم هەر لە دێیەكەی خۆمانەوە و ژن و منالەكانم و براكانم و كەس و كارم و شێخ موعتەسەم و چەم ئالیاوا و چەمچەماڵ و تۆپزاوا و ئەو عالەمەی لە قاعەكان و دوو گەنجەكەی ناو سەیارەكەمان و هەموو ئەم شتانە ئەهاتنەوە پێش چاوم ئەمە تەنها لە رێكردنی بەردەم سەیارەكەمان تا ئەو پێنج مەترەی دوورمانیان خستەوە و پێمانی دەووت(ئوگعود)پاڵمانی خست لەسەردەم و پێمانی ووت شایەتمان بهێنن.. ئێمە هەر شایەتمانمان

ئـــەهێنا و لەبـــەر خۆمانـــەوە ئەپاڕاینـــەوە   ئـــەوانیش بەعـــەرەبی شتێکیان خوێند نازانم چی بوو ئایـەت بـوو نـازانم قسـەی سـەدام بـوو ئەیانخوێند نازانم چی بوو..

*** بە چ شێوەیەك لەسەر زەویەکە پاڵتانیان خستبوو..؟**

- ئەی نەموت لەسەر دەم.. دەستی هەردوکمان لەپشتەوە بەسـترابوو بەیەکەوە توند تونـد بەسـتبویان چـاومانیش بـە جامانـەکانی خۆمـان بەسترابوو گیانمـانی نوسـاندبوو بەیەکـەوە.. ناوچـەوانمانی نوسـاندبوو بـە زەویـەوە و چـاوەڕێ بـوین کـە پەنجـە بخاتـە سـەر پەلـە پیتکـەی تفەنگەکانیان و فیشەك لە پشتی سـەرمان بـدات و لـە ناوچـەوانمانەوە دەرچێت..

*** کەسێکی تر هەبوو لە نزیکتان وەستابێ و فەرمان بداتـە سـەربازەکان بڵێ دەست پێبکەن..؟**

- زۆری لێبـوو گـوێم لێ نـەبوو کـەس فـەرمانی وابـدات.. هـەر دوای ئـەوەی ئێمـە لـە شـایەتمانهێنان بوینـەوە و دوای ئـەوەی ئـەوانیش شتێکیان خوێند ئیتر تەنها گوێم لە تەقە بوو..

*** تەقەی سەربازی تـر کـە لـە تەنیشـتانەوە خـەڵکی تـری گوللـە بـاران ئەکرد..؟**

- نەخێر تەقەی ئەو دوو سەربازەی کە ئێمەیان گولله باران کرد..

*** ئەکرێ ئەو حاڵەتەم بۆ باس بکەی کە تەقەکان دەستی پێکـرد و چـی روویدا..؟**

- من هەرچەند چاوم بە جامانەکەی خـۆم بەسـترابوو بـەڵام لەگـەڵ یەکەم فیشەکدا هەستم کرد کە دوای ئەوەی لە ئەملا و ئـەولای سـەرم و شان و گشت گیانمدا ئەیدا بە زەویەکەدا و قوڕ و خۆڵی هـەڵ ئەدایـە ئاسماندا و هاوار و یـەك دوو جـار لرخـە لرخـی صـاڵح ئامۆزاشـم گوێ

لێبوو کە کاتێ فیشەکەکان دای لێی و لەتاو ئازار هاواری دەکرد و گۆشت و خوێن بەرگیانی منیش دەکەوت.. لەبەر ئەوەی گیانمان پێکەوە نووسابوو لە کاتی گولله بارانکردنەکەشدا کاتێ صالح ئامۆزام بەرکەوت و لەگەڵ فیشەکەکەدا هەڵبەزیەوە کەوتبوە سەر لایەکی من و خوێنەکەی رژابوە سەر مندا.. بەلام من دوای تەقەکان ئیتر وا هەستم کرد کە منیش کوژراوم.. هەست ئەکەم ماوەیەکیش ئاگام لەخۆم نەمابوو، چونکە دوای تەقەکان تا ماوەیەك دوای ئەوە نازانم چی رویداوە.. بەلام هەندێ دوای ئەوە هاتمەوە سەرخۆم هەستم کرد من نەمردووم و ماوم بەلام هۆشم بەخۆم نەبوو حەپەسابووم هەر دەنگی تەقەی تر دەهات و گوێم لە هاوار و ناڵە بوو گوێم لە ئاخ و ئۆف و شایەتمان بوو ئەمزانی من کە نەمردووم ئەمزانی کە برینداریش نیم بەلام وا هەستم ئەکرد کە رۆحم زامداربێ.. جوڵەم لێ براببوو وەك جەنازە وابووم ئەمویست بجوڵێم بزانم ماوم، نەم ئەتوانی بجوڵێم.. کاتێکم زانی بەسەر زەویەکەدا هەردووکمان رادەکێشن و لە لێوارێکی بەرز بەرمانیان دایەوە کەوتینە سەر کۆمەڵێ جەنازەی تردا فیشکەی خوێن دەهات هاوار هاوار بوو هەبوو بریندار بوو هێشتا نەمردبوو لەتاو ئازاری گیانی ئەینالاند ئەپاڕایەوە.. وردە وردە هەستم دەکرد خەریکە دێمەوە سەرخۆم ئەزانم من ئێستا لە کوێم شتەکانم بیر کەوتەوە ئەزانم ئەم کۆمەڵە جەنازەیە کە کەوتون چین و ئەشمزانی یەکێك لە لاشەکانی تەنیشتم سالحی ئامۆزامە.. هەستم ئەکرد ئێستا وا باشتر گوێم لە دەنگیدەسترێژی گوللەیە و گوێم لە نەرە نەڕی شۆفلە وا ئیش دەکەن بەلام هێشتا نەمتوانیوە دەستم بکەمەوە و چاویشم هەر بەستراوەتەوە.. ئەمزانی کە ئەمە ئەو شوێنەیە کە ئیتر بە شۆفڵ خۆڵ ئەکەن بەسەرماندا و وام دانابوو کە

جوڵە لەخۆم ببڕم تا نەزانن من زیندووم کەی شۆفڵ خۆڵی کردە سەرماندا و ئەوان ڕۆیشتن من لەژێر خۆڵەکەدا دەرچم.. بەڵام وردە وردە زیاتر فکرم دەکەوتە کار لەخۆمم دەپرسی کە من ئێستا ناتوانم لاشەیەك لەسەر خۆم لابەرم چۆن ئەتوانم بە بالای زەلامێك خۆل لابەرم..کە ئەوەم لێك ئەدایەوە وردە وردە هێزم ئەدایە خۆم هەستم کرد کە ئێستا ئەتوانم بجوڵێم هەندێ خەریکی دەستم بووم توانیم دەستم بکەمەوە و بە هێواشی جامانەکەشم لەسەر چاوم لابرد بەڵام بڕوا بکە تا پێنج دەقیقەش جامانەکەم لابردبوو توند چاوی خۆم نوقاندبوو نەم ئەوێرا چاوم بکەمەوە.. لەم ماوەیەشدا چەند لاشەیەکی تریان بەردایەوە سەرمان کەمن کاتێ چاوم کردەوە هەرچەند دونیا تەواو تاریك ببوو ناو چاڵەکەش تاریکتر تەماشای ئەملاو ئەولای خۆمم کرد هەموو لاشە بوون لەناو لاشەکاندا تەرمی ئەو دوو کوڕە گەنجەم بینی کە ئێستاش ئازاریان وا لەناو دڵمدایە و بەقەدەر براکانی خۆم زیاتر خەفەتم بۆ خواردن.. من پێشیان کەوتم تا مەرگی ئەوان نەبینم کەچی لاشەی هەردوکیان لەبەر دەستم بوو.. چاوم لێبوو لەوسەری چاڵەکەوەشۆفڵ ئیشی ئەکرد لایتەکەی لەناو چاڵەکە ئەدا بەدرێژاییەکی زۆر هەمووی لاشەی لەسەر یەك بوو ئاگام لێبوو دوو سەرباز هاتن بەناو لاشەکاندا ئەگەڕان ئەوەی کە بریندار بوو ئەجولایەوە و هاواری بوو دەستڕێژیان لێ ئەکرد و ئەیانکوشت.. ئەمجا وەخت بوو زراوم بچێ ئەمجارە زۆر ئەترسام زۆر لەو حاڵەتە ناخۆشتربوو.. ئەمجارە ژیانم زۆر لا خوشەویستربوو ئەپاڕامەوە ئایەتولکورسیم ئەخوێند کە هەست نەکەن ماوم.. هەناسەم لەخۆم بڕیبوو.. هەرچەندە هیچ ئومێدێك نەبوو بۆ ڕزگار بوونم و ترسی ئەوەم هەبوو کەپاش کەمێکی تر بە شۆفڵ خۆڵ بکەن بەسەرمدا

کـەچی زۆر ئەپاڕامـەوە ئـەم دوو سـەربازە نـەمکوژن.. خواکـردی ئەوانیش بەسەرمدا تێپەڕین و کە بەسەر لاشـەکاندا ئەڕۆیشـتن گوێـم لـە قرچـەی شـکانی ئێسك بـوو لـە ژێـر پێیاندا کەبەسـەر لاشـەکاندا ئەچوون.. دوای ماوەیەك کە رەنگـە سـەعاتێکی پـێ چووبـێ هـەر ئـاوا لەناو لاشەکاندا بووم..تەواو تاریك ببوو ئەمجارە سەرم بـەرز کـردەوە تەماشای ئەملاو ئەولام ئەکرد بە بیرمدا هات کـە نـاوی خـوا بهێنم و هەوڵدەم لەناو لاشەکان دەرچم بەڵام لەشم هەمووی هەر خوێنە بەناو لاشەکاندا هەندێ لەسەر چۆك و هەندێ بەزگە خشێ رۆیشتم هەستم کرد کەس ئاگای لێ نیە بەوشێوەیە چاڵەکەم بڕی کە بـە پانـایی چـوار مەتر و درێژیەکەی زۆر زۆر بـوو دیـاربوو شۆفڵ بـەناویدا رۆیشـتبوو چونکـە ئەوسـەری قوڵیەکـەی کـەمبوو شـۆفڵەکە لـەوێوە سـەرکەوتبوو منیش بەشوێن شۆفڵەکەدا دەرچووم بێ ئەوەی ئاوڕ بۆ دواوە بدەمەوە رامکرد ماوەیـەکی زۆر کـەم رۆیشـتم کەوتمـە چـاڵی لاشـەی تـرەوە ئەویشم بڕی چەندین چاڵی پڕ لاشە و چـاڵی تـری ئامـادەکراوم بینـی هەر رام ئەکرد و ناوەسـتام یەکـەمجار ئـاوڕم بـۆ دواوە دایـەوە هەسـتم کـرد ماوەیـەکی بـاش دوور کەوتومەتـەوە و لایتـی سـەیارەکانم لێـوە دیاربوو ناوچەکە وەك ئەوە وابوو نـاو دۆڵێکـی پـان بێـت ئیـتر مـاوەی زیـاتر لـە سـەعاتێ رێگـەم بـڕی ئـەوجا دانیشـتم و کـەمێك پشوومدا..لەبەر ئەوەی لەناو سەیارەکەدا کە لە تۆپزاواوە بردمانیان و ناو سەیارەکە زۆر گەرم بوو ئەوجا لەتاو گەرما پێڵاوەکانم داکەندبوو کـاتێ دامانیـان گـرد بـۆ گوللـە بـارانکردن پێـم پـەتی بـوو.. دوای ئـەو سەعاتە راکردن و بەپێ بڕینە هەستم کردکە پێم ژان ئەکات.. هیلاك و ماندووم تینووم ئازارم هەیە ئەترسام.. ئیتر خۆیشم نەم ئەزانی بـۆ کوێ ئەچم هەر رێگەم ئەکرد بـێ ئـەوەی بـزانم رووم لـەکوێ یـە.. لـە

هەر شوێنێ ئاوەدانی دیار بوایە لە ترسا رووم تێناکرد و خۆشم نەم
ئەزانی ئەمەوێ بۆکوێ بچم.. چونکە گیانم بە خوێنەوەبوو نازانم
بۆنیان کردبوو چی بوو هەندێ سەگ بە وەڕە وەڕ بۆم هاتن دەستم بۆ
زەوی ئەبرد و هەمووی لم بوو هیچم شك نەبرد پەنای بۆ ببەم زۆر
ئەترسام کە سەگ بمخوات سەد خۆزگەم ئەخواست وەك ئەو خەڵکە
منیش فیشەکەکان بەرم بکەوتایە و بمردمایە و رزگارم نەدەبوو..
ناشوکریم ئەکرد و ئەمووت خوا بۆ نەگبەتی منی هێشتەوە سەگەکان
زۆر تەنگیان پێم هەڵچنی لەتاوا خۆم وەك ئاژەڵی چوارپێ لێکرد و
هەتا هێزم تیابوو ئەمنەڕاند و مۆڕەم لە سەگەکان ئەکرد.. هەستم
کرد کەوامکرد سەگەکان هەڵوێستەیان دەکرد و ئەگەڕانە دواوە..
فرسەتم بینی و زیاتر ئەمنەڕاند و ئەمجارە من بەرەو رویان چووم
سەگەکان لە ترسا رۆیشتن و لە دوورەوە پێم ئەوەڕین ئیتر ئەو شەوە
تا رۆژ بۆوە من هەر رێگام بڕی لەکوێ لایتی سەیارە دیاربوایە بۆی
ناچووم ئاوەدانی لە هەر شوێنێك دەرکەوتایە ئاراستەی رێگەکەم
ئەگۆڕی تا رۆژم لێ بۆوە.. ئیتر بەرچاوم رونتر بوو هەرچەند
نەمدەزانی ئەم شوێنە کوێ یە بەڵام کە رۆژ بۆوە و روناکی خۆرم
بینی هەر لە خۆمەوە ئومێدم لا دروستبوو کە پشت بەخوا رزگارم بوە
زۆرم برسی بوو کەوتمە(جۆ) خواردن.. لە دوورەوە جۆگە ئاوێکم
بینی منیش هیلاك و تینوو وا کوێر ئەبم بۆ قومێ ئاو رۆیشتم ئاوم
خواردەوە دەست و پێ و دەم و چاوم شۆری هەندێ جلەکانم پاکردەوە
کە بە خوێنەوە بوون هەموو لەشی خۆمم تەڕکردبوو تا خوێنەکە
لەگیانم بێتەوە خۆمم دابوە بەرخۆرەکە کاتێکم زانی کابرایەکی
ئەختیار وا بەرەو لای من دێت و دیاربوو ئەو منی بینیبوو هیچ
چارەیەکم نەماو شوێنێ نەبوو خۆمی لێ بشارمەوە و زۆر ترسم لێ

نیشت لەم دەشتە چۆڵەدا ئەم کابرایە چیە پەیدابوو.. کاتێ هات و نزیکەوە بوو کە سلاوی لێم کرد و کەوتە قسەکردن لەگەڵمدا تەماشام کرد (کورد)بوو شوان بوو.. ئیتر وەك ئەوەی تازە لەدایك بم ئاوا هەموو ناخۆشیەکم لەبیرچووەوە.. وەك ئەوە وابوو خوا لە ئاسمانەوە ئەم پیاوەی کردبێ بە فریشتە و بۆمنی ناردبێ.. لێمی پرسی بۆ وا کەوتویتەتە ئەم دەشتە بۆ گیانت بە خوێنەوەیە بۆچی پێت پەتیە.. هەستم کرد زۆر بە پەرۆش و خەمخۆریەوە ئەم پرسیارانەی کرد، منیش زوتر لای خۆمەوە تەگبیرم کردبوو کە ئەگەر توش هەر ئاوەدانیەك بووم ئەلێم سایەق سەیارەی ئیشغالم و وەرگەڕاوین لەسەیارە و هاورێکانم مردوون و رێگام لێ گۆڕاوە.. کە ئەمەشم بە کابرا ووت زۆر بەزەیی پێمدا هاتەوە.. منیش لە ئەوم پرسی کە ئەو چی دەکات لێرە و ئێرە کوێ یە من چیبکەم.. ووتی ئێمە کوردی ئێرانین دەمێکە لێرەین و لە کەمپێکداین لە نزیك(رومادی) ئیتر زۆر دانیشتین و دڵی دامەوە و رێگای بۆ کێشام کە چۆن بچم بۆناو ئۆردوگاکە و ناونیشانی ماڵێکی داپێم کە تەکسی هەیە و ئیش ئەکات تا ئەو بمبات بۆ (رومادی) و لەوێوە بۆ بەغدا بچم..

کاتێ بەرەو لای ئەو شوێنە دەچووم کە پیرەمێردەکە ناونیشانەکەی دابووپێم تووشی رەبایەیەك بووم کە هەمووی‌عەسکەری بوو زۆر ترسام وام ئەزانی ئەوان بە وەزعەکەی من دەزانن و ئەمناسنەوە و ئەمگرن بەلام ئەوان هەر لە دوورەوە تێمیان خوڕی کە نزیکی رەبایەکە نەبمەوە و دوور بگرم..کەمێك هۆشم هاتەوە و شوکرانەیەکی خوام کرد کە ئەمجارەش رزگارم بوو.. نزیکی بانگی نیوەڕۆ بوو گەیشتمە ئەو ئۆردوگایەی کە پیرەمێردەکە ناونیشانی داپێم.. سەرەتا توشی هەندێ گەنج بووم(خشتیان ئەبڕی) سلاوم

لێیان کرد بە کوردی وەڵامیان دامەوە و ئەوان زۆر بەسەر سامیەوە تەماشامیان ئەکرد کە غەریب بووم و بەپێی پەتی و سەرو ملێکی شێواوە وە چومەتە ئەوێ و جلی کوردیم لەبەرە بەلایانەوە سەیر بوو هەرکەس ئەیپرسی هەر ئەو قسەیەی یەکەمجارم دەکردەوە کە سایەقم لە ئیشغاڵ و سەیارەکەم وەرگەڕاوە، بە پرسیار ماڵەکەم دۆزیەوە کەپیرەمێردە شوانەکە ناونیشانی داپێم..

لە دەرگای ماڵەکەم دا ژنێك دەرگای کردەوە سڵاوم لێکرد و چومە ژوورەوە، زۆر سەرسام بوو بێ ئەوەی خولکم بکات خۆم کردە ژووردا.. دانیشتم و پرسیاری ئەو ناوەم کرد کە ناونیشانیان دابووپێم.. وتی نیە لەماڵ و وەزعی خۆم جارێکی تر باس کرد کە چۆن وەرگەڕاوم و شەوو رۆژێکە رێگەم لێ تێکچوە و نانم نەخواردووە.. ژنەکەیش بەزەیی پێمدا هاتەوە نانی بۆ هێنام و چایی بۆم کرد و نیو سەعاتێ دوای ئەوە(مێردەکەی) هاتەوە.. ئەویش کاتێ چاوێ بەمن کەوت سەرسام بوو کە ئەم کابرایە چی دەکات لەماڵیان.. سەر لەنوێ ئەو وەزعەی بۆ خۆمم رێکخستبوو بۆ ئەویشم گێڕایەوە و داوای هاوکاریم لێکرد کە بمبات بۆ شوێنێ کە بتوانم بگەڕێمەوە بۆ کوردستان.. وتی من ناتوانم بتبەم چونکە منیش کە سەیارەم هەیە رۆژی یەکجار بە کارت بۆمان هەیە لەم ئۆردوگایەدا دەربچین من نۆرەی خۆم تەواو کردوە و ناتوانم جارێکی تر دەربچم لە ئۆردوگاکە چونکە ئێمەش وەك زیندانی واین.. ئیتر زۆر نائومێد بوومو دیاربوو بە روخسارمەوە

کە هەستاین و بینی پێم پەتیە بەلایەوە سەیر بوو وتم ئێستا پێڵاو ئەکرم رازی نەبوو لەماڵی خۆیان(جوتێ نەعل)یان داپێم دیاربوو ئەم حاڵەتە بۆمن باش بوو زیاتر بەزەیی پێمدا هاتەوە و ووتی بابڕۆین ئێستا رێگەت بۆ دەکێشم چی بکەیت.. کە هاتینە دەرەوە لەگەڵم هات

تا دەرەوەی ئۆردوگاکە ووتی ئەم ئۆردوگایە مراقەبەی زۆری لەسەرە بانەتگرن دیاربووکابرا هەستی بەشتی تر کردبوو پێمی ووت لەناو ئۆردوگاکە سواری سەیارە مەبە چونکە ئەوە سەیتەرەیەکە لەوێ یە نەوەك داتبگرن و رێگەیەکی تولەرێی نیشاندام کە بە پێ بەو رێگایەدا برۆم تا دەگاتە سەر رێگا سەرەکیەکە و لەوێدا راوەستم تا ئەو کاتەی سەیارەی ناو ئۆردوگاکە کە نۆرەیەتی بچێت بۆ رومادی دێت و دەستی لێ رابگرم و لەگەڵی سەرکەوم..ویستی پارەم بداتێ پێم ووت کە پارەم پێیە.. چونکە ئەو پارەیەی لە نێوان چەمچەماڵ و تۆپزاوا لەناو(دەرپێ کورتەکەم)شاردبوومەوە هەرمابوو.. وەك ئەم کابرایە رێی بۆ کێشام بە رێگاکەدا رۆیشتم و لەسەر رێگا سەرەکیەکە راوەستام ماوەیەکی پێچوو سەیارەیەکی(١٨نەفەری) لە دوورەوە کە لە ئۆردوگاکەوە دەرچووبوو دەهات.. ئیتر تا سەیارەکە گەیشتەلام هەر دەپاڕامەوە خوایە هەڵم بگرێ و زۆریش ئەترسام کێ ئەڵێ(ئەمن و پیاوی حکومەتی تیانیە) و نازانێ من وام بەسەر هاتووە و نامگرن.. زۆر ئەترسام و دڵی خۆشم ئەدایەوە خۆ قابیلە غەیبیان پێ نیە بەچی ئەزانن..

سەیارەکە هێشتا زۆری مابوو بگاتەنزیکم دەستم بۆی راگرت.. ئەموت نەك من دەست رابگرم و سایەقەکە ئاگای لێ نەبێ ..بۆ ئەوەی بمبینێ با هەر لەدوورەوە ئیشارەتی بۆبکەم..

کاتێ گەیشتە راستم راوەستا.. زۆر بەترسەوە ئەو دوو هەنگاوەم بڕی کە لەنێوان من و سەیارەکە دابوو ئەویش دەرگاکەی لە تەنیشتەوە بوو بێ ئەوەی بەدەست خۆم بێت کە دەستم بۆ دەرگای سەیارەکە برد دەستم گەڕاندە دواوە دیمەنی ئەو سەیارەیە هاتەوە پێش چاوم کە بەر لەم سەیارەیە دوا سەیارەبوو بینیبووم و سواری

بووم بۆ ئەوەی بمانبەن بۆ گوللەبارانکردن.. ئەترسام وەك ئەوەی لەناو سەیارەکە لاشەی دوو کوڕە گەنجەکە و سالّح ئامۆزامی تیابێ.. وەك بلّێی لەناوەوەی سەیارەکە هەستیان بەم هەلّوێستەی من کردبێ کەسێك لەناوەوە دەرگاکەی کردەوە.. بە کردنەوەی دەرگاکە ترسەکەم شکا و یەکسەر سەرکەوتم.. تەماشام کرد زۆربەی کورسیەکانی گیراوە.. سلاّوم کرد یەکێك لەناو هەموویاندا سلاّوەکەمی سەندەوە و ووتی فەرەج بێرە ئێرەوە..

*** لەناو هەژدە نەفەریەکە کەسێك ناسیتی.."؟**

- ئائا.. هەر دوای ئەوەی سلاّوم کرد یەکێك لەناو سەیارەکەوە بانگمی کرد کە بچمە تەنیشتیەوە..

*** لەو کاتەدا هەستت بەچی ئەکرد..!؟**

- یەکەمجار زۆر ترسام و وام ئەزانی لەناو گۆڕە بە کۆمەلّەکانەوە بە شوێنمەوەیە و هاتووە من بەرێتەوە بۆ شوێنی رەمی کردنەکە بەلاّم لەهەمانکاتدا زۆر دلّم خۆشبوو من ئەوەی دیبووم وا هەستم ئەکرد کە ئیتر کەسێك نەماوە من بیناسم بۆیە موچرکەی خۆشی بە گیانمدا هات کەوا کەسێك هەیە لەم دنیایەدا فەرەج ئەناسێتەوە..

*** تۆ ئەو کەسەت ناسی کە بانگی کردی بچیتە تەنیشتیەوە..؟**

- سەرەتا نەمناسی و چومە تەنیشتیەوە دانیشتم هەندێ تەماشای یەکتریمان کرد ناسیمەوە کە(عوزێر)بوو خەلّکی ناوچەی لەیلان بوو ئەویش وەك من گیرابوو ئەویش لە گوللەبارانکردنەکە رزگاری ببوو..

*** چیتان ووت کە چونە تەنیشت یەکتریەوە..؟**

- ئەو وتی چی ئەکەی لێرە.. منیش وتم وەك تۆ ، کە وام ووت ئیتر ئەویش حالّی بوو لەناو سەیارەکە بۆ ئەوەی خەلّکەکە بە وەزعەکەمان نەزانن هیچ قسەیەکی ترمان لەو بارەیەوە نەکرد..

*** پاسەکە بۆکوێ ئەچوو هەر بە ڕێکەوت سواری ببوون بێ ئەوەی بزانن بۆ کوێ ئەچێ یان شوێنێك هەبوو سەیارەکە بۆ ئەو شوێنە دەچوو ئێوەش بە هیوای ڕزگاربوون رووتان لەوێ کردبوو..؟**

- ئێمە بۆ هەر شوێنێ بچوایە سواردەبوین گرنگ ئەوەبوو لە شوێنی گوللەبارانکردنە کە دوورمان بخاتەوە و بەرەو ئاوەدانیمان بەرێت تا بگەڕێینەوە بۆ کوردستان بەلاّم ئەمانزانی بۆ رومادی ئەچێ..

*** لە ئاوەدانی ناترسان..؟**

- زۆریش ئەترساین بەلاّم چارەیەکی ترمان نەبوو

*** هەستت ناکرد بەوەی تێکەڵ خەڵك بن بەهۆی ئەوەی وتت گیانم بە خوێنەوە بوو خەڵك شك بکاتە سەرتان و بناسرێنەوە یا ئاشکرابن...؟**

- من هەر لەسەر ئاوەکە گیانی خۆم شۆرد بە رووکەش پێمەوە دیارنەبوو کە خوێن بەگیانمەوە بوبێ بەلاّم هەستم ئەکرد بۆنی خوێنم لێدێت.. عوزێریش لەوێ گیانی بەخوێنەوە نەبوو ئەویش خۆی پاکردبۆوە.. بەلاّم چونکە خۆمان ئەمانزانی لەکوێ وە دێین هەر لە خۆمانەوە بەشك بوین کە بمان ناسن و بمانگرن بۆیە زۆر ئەترساین ئەمانوت ئەگیرێین..

*** ماوەی چەنێ بە ڕێگاوە بوون تا گەیشتنە روومادیێ..؟**

- نیو سەعات ئەبوو..

*** کەستان جاری تر روومادیتان بینیبوو..؟**

- من نەمبینیبوو بەلاّم ماڵی خوشکێکی عوزێر لەوێبوو بەوە دڵمان خۆش بوو کە ئەچینە ماڵ ئەوان تا ڕێگا چارەیەك ئەدۆزینەوە..

*** تۆ پێشتر ئەتزانی ماڵی خوشکی عوزێر لە رومادیە..؟**

- بەڵێ عوزێر لە ڕێگە لەناو سەیارەکە وتی ئێستا ئەچینە رومادی ماڵی خوشکێکم لەوێیە ئەچینە ماڵ ئەوان   من سەرەتا وامزانی بۆ ئەوە ئەو قسەیەی کرد کە خەڵکەکەی ناو پاسەکە شك نەکەن ئێمە غەریبین بەلاّم دوایی زانیم کە بە راستیەتی   خوشکەکەی ناوی(نایل) بوو ژنی کابرایەك بوو ناوی (حاجی حەسەن)بوو..

*** لەو بارە پڕ مەترسیەتاندا هەستت بەچی کرد کە دڵنیابووی ماڵی کەسێکی ئازیزی هاوڕێکەت لەو شارەدایە..؟**

- ئومێدی زۆرم لادروست بوو کە ئەژێمەوە، ناگیرێین، بە ئاسانی ئەگەڕێینەوە ولاّتی خۆمان و ئەو ماڵە هەموو هاوکاریەکمان دەکەن.. بەلاّم بۆ نەگبەتیەکەی ئێمە زۆر گەڕاین ماڵیانمان نەدۆزیەوە ئیتر تەواو بێ ئومێد بووین وتمان دیارە چارەیەکی رەش لە ناوچەوانمان نووسراوە ئەشترساین کە بە جلی کوردیەوە ئەوەندە سوڕاینەوە لەناو رومادی بمانگرن.. بەلاّم چونکە ئیشغاڵ خەریکی رێگەوبان بوون و کوردیش بەهۆی سایەقی و کرێکاری ئیشغاڵەوە هاتووچۆی هەبوو کەس گومانی نەخستە سەرمان و ماڵی کوردیشی تیابوو بەهۆی ئەوەوە کەس پرسیاری لێمان نەکرد بەلاّم کەسمان(جنسیە)مان پێ نەبوو ئەگەر یەك شورتەمان توشبوایە ئەمانی گرت..

*** وتت لەناو سەیارەکە لە ترسی ئەوەی نەبا ئاشکرابن لەگەڵ (عوزێر)دا زۆر قسەتان نەکردووە.. بەلاّم کاتێ دابەزین لەناو(رومادی) کاتێ کەسی ترتان لا نەبوو ئەمجا نەتپرسی ئەو چۆن رزگاری بووە..؟**

- با، هەردووکمان پرسیارمان لە یەکتری کرد و هەردوکمان بەسەر هاتەکەمان بۆ یەکتری گێڕایەوە..

*** ئەو چۆن رزگاری بوو..!؟**

- من نازانم له تۆپزاواوه بەرەو شوێنی گوللەبارانکردنەکە پێکەوە بوین یان نا.. بەلأم عوزێر ئەیوت منیش لەناو قافڵەکەی ئێوەدا بووم.. هەرچەندە باسی ئەکرد ئەو سەیارەیەی ئەویان پێ بردبوو لەوانەی ئێمە جیاواز بوو.. شێوازی گوللەبارانکردنەکەشی وەك عوزێر دەیگێرِایەوە لەو شێوەیە جیابوو کەمن بینیم و ئێمە کاتێ گەیاندمانیانە شوێنی گوللەباران کردنەکە خۆری مابوو.. کەچی عوزێر ئەیوت کە ئەوان گەیشتوون دونیا تەواو تاریك بووە، بۆیە من قەناعەتم وایە کە لە دووکات و دوو قافڵە و شوێنی جیابوبێتین.

(عوزێر) ئەیوت دوای ئەوەی گەیشتوینەتە شوێنی گوللەبارانکردنەکە تەواو دڵنیابوین لەوەی کە هەموومان گوللەباران دەکەن و لە درزی دەرگای سەیارەکەوە چاومان لێبوو کە ئەوانەی ناو سەیارەکانی تریان داگرتۆتە خوارەوە و رەمی کراون،لەناو سەیارەکەی خۆماندا تەگبیرمان کردووە کە ئەوکاتەی دێن و دەرگای سەیارەکەی ئێمە دەکەنەوە و ئەیانەوێ دامانگرن بۆ گوللەبارانکردن.. ئێمە پەلاماری سەربازەکان بدەین ، هەرچەندە برسێتی و تینوێتی هێزی لەبەر بریبووین بەلأم تەگبیرمان وابووە کە بە دوو سێ کەسمان پەلاماری ئەو سەربازە بدەین و چەکەکەی لێ وەربگرین و بەرگری لەخۆمان بکەین.. ئەیوت یەکەمجار کورێکمان لەگەڵ بووە ناوی(سەلام) بووە کە یەکەمجار سەربازەکە دەرگاکەی کردۆتەوە ئەم (سەلام)ە شەقێکی بۆ داوەشاندووە بەلأم سەربازی دووەم لەناو دەرگاکەدا(سەلامی کوشتووە)و دەرگاکەیان داخستۆتەوە.. جارێکی تر دەرگاکەیان کردۆتەوە و سەربازەکە هاتۆتە ژوورەوە بۆناو سەیارەکە تا یەکێك پەلکێش بکات بۆ گوللەبارانکردن لەوکاتەی وا چاوی گەنجێکی کوردی بەستۆتەوە ئەمان پەلاماریان داوە و بەهەر حاڵێك بووە

چەکەکەیان لێ سەندووە بەڵام سەربازەکە توانیویەتی مەخزەنی تفەنگەکەی دەرکات و فرێی بداتە دەشتەوە ئیتر هەر لە دەرەوەی سەیارەکەوە لە هەموو لایەکەوە سەیارەکەیان داوەتە بەر دەستڕێژی گوللە و ئەو جەلادەی خۆشیان کە هێشتا لەناو سەیارەکە بووە کوژراوە و یەکسەر کۆمەڵێکی هاوەڵەکانی عوزێر هەر لەسەر ئەو کورسیانەی لەسەری دانیشتوون کوژراون و لەترسا ئەوەکانی تر خۆیان کردۆتە ژێر کوشنەکانەوە ئەیوت ئەوەندە گوللەیان ناوەتە سەیارەکەوە وەك(بێژنگ)کون کون بووە و خوێن بەناو سەیارەکەدا خورەی ئەکرد کە ئەو هەموو گەنجەیان کوشتبوو، وەك(عوزێر) ئەیووت کە دونیا تاریك بووە دوای ئەوەی تەقە کردنەکە کۆتایی هاتووە سەربازەکان دڵنیابوونە لەوەی کە هەموو ئەوانەی ناو سەیارەکەیان کوشتووە و کاتێ عوزێریش دڵنیابووە لەوەی کە سەربازەکان دوور کەوتونەتەوە لە سەیارەکەیان دابەزیوە و خۆی دزیوەتەوە و بەناو تاریکیەکەدا رایکردووە سەرەتا کەوتۆتە چاڵێکی پڕ لە لاشەوە ئەیوت کەوتمە سەر لاشەیەکدا هێشتا گیانی تیا مابوو خوێن لە دەم و لوتیەوە دەرئەچوو.. رێگای کردوە تا دەمەو بەیان گەیشتۆتە هەمان ئەو ئۆردوگایەی کە من بۆی چووم و چەند ماڵێکی کردووە تا جێیان کردۆتەوە نانیان داوە پێی و دوای بەسەرهاتەکەی بۆ ماڵەکە گێڕابۆوە لەترسا نەیانوێرابوو داڵدەی بدەن و رێگایان بۆ کێشابوو کە سواری ئەو سەیارە بێت بەرەو(رومادی) تا لەوێوە بگاتە بەغدا و پاشان بەرەو کوردستان..

*** تۆ پێت وانیە خەڵکی تریش هەبوبێ وەك تۆ و عوزێر ئەویش لە گوللەبارانکردنەکە رزگاری بوبێ و دواتر رێگای دەرباز بوونی نەدۆزیبێتەوە لەو دەشت و دەرەدا گیان لەبەری کێوی خواردبێتی یا لەبرسا مردبن و**

**دووریش نیە گەیشتبێتنە ئاوەدانیو جارێکی تر بەردەستی کاربەدەستانی بەعس کەوتبێتنەوە و کوشتبێتیان.. تۆ ئەڵێی چی،..!؟**

- وەڵا بەدووری نازانم حاڵەتی وا زۆر بوبێ چونکە ئێمە بێ ئەوەی ئاگامان لە کارەساتی یەکتربێ، بە رێکەوت لەگەڵ (عوزێر)دا یەکمان بینی و رزگارمان بوو دوو سێ کەسی تریش هەر گەڕابوونەوە و رزگاریان بوو ئێستاش ماون.. رەنگە خەڵکی تریش هەبوبێ دوای جارێکی تر تیاچوبێتەوە.

*** لە رومادی چونە گەراج سواری سەیارەبوون یاخود سەیارەیەکی تایبەتی تان گرت بۆ بەغدا..؟**

چوینە گەراج، کە ئێمە چوین سەیارەیەکی (٢١)نەفەری ئامادەبوو سواربوین تەماشامان کرد (ئینزیباتی)تیابوو.. زۆر ترسام هەر لە خۆمەوە وام لێك ئەدایەوە کە ئەمانگرن و کەوتمە دڵە راوکێ و وا هەستم ئەکرد کە خوا لە چارەی نووسیوین نابێ رزگارمان بێ و ئەوەتا بەپێی خۆمان کەوتینە ناویانەوە.. لەبەر ئەوە نەمانوێرا زۆر سەیر بکەین تا بزانین لەکوێوە جێگای چۆڵ هەیە تا هەردووکمان پێکەوە دانیشین و نەشمان وێرا دابەزینە خوارەوە، لەترسا هەریەکی لەلایەکەوە دانیشتین.. من دوو ئینزیبات لەملاوئەولامەوە دانیشتبوون نەم ئەوێرا تەماشای هیچیان بکەم، هەرچەندە گیانم خوێنی پێوە نەمابوو بەلاّم وا هەستم ئەکرد کە بەگیانی خوێناویەوە لە تەنیشتیان دام و ئێستا ئەمناسنەوە.. جوڵەم لەخۆم بڕیبوو.. هەندێ سەربازی تریش هاتن سواربوون و جگە لەمن و عوزێر ئیتر هەموو نەفەرەکانی ئینزیبات و سەرباز بوون.. لە رومادیەوە کەوتە رێ بەرەو بەغدا و تا ناو بەغدا بەچەند سەیتەرەدا رۆیشتین کە لە هەریەکیاندا خەریك بوو زراوم بچێ ئەموت ئێستا داوای ناسنامەمان لێدەکەن و ئاشکرا

دەبین و دەمانگرن.. بەلآم دیاربوو لەبەر ئەوەی هەموو پاسەکە جگە لە ئێمە سەرباز بوون و جلی نیزامیان لەبەر بوو لە هیچ کام لەو سەیتەرانە نەمانیان پشکنی و بەسەلامەتی گەیشتینە بەغدا و کاتیَ لەسەیارەکە دابەزیم ئۆخەیەکم کرد و هەستم کرد هەناسەیەکی خۆشیم هەلْمژی.. ئەمجارە شوکرانەی خوام کرد و وتم ئەمانە بۆ ئێمە بوونە فریشتە و بە هۆی ئەوانەوە لەو هەموو سەیتەرەیە رزگارمان بوو ئینشائەلآ خوا رەحمی پێمان کردووە..

*** بەرنامەتان چیبوو کاتیَ گەیشتنە بەغدای پایتەخت.. ئەو شوێنەی بڕیاری گرتن و کوشتنی ئێوەی تیادرابوو..؟**

- بەرنامەمان چیبێت.. ئێمە لە ئیرادەی خواوە نەمردبوین و رزگارمان ببوو ئەمانویست بگەڕێینەوە بۆ ولآتی خۆمان بۆ ناو کەس و کارەکانمان..

*** کە گەیشتنە بەغدا یەکەم شت چیتان کرد..!؟**

- کە لە کۆستەرەکە دابەزین وەك ئەوە وابوو لە سجن ئازاد بوبین.. یەکسەر سواری تەکسیەك بوین و بۆ (باب ئەلشێخ) بۆ تەکیَی شێخ عبدالقادر گەیلانی.

*** بۆچی چون بۆ ئەویَ..؟**

- چوین نوێژمان کرد و گەلیَ لەخوا پاڕاینەوە و شکور بووین بەو حالە و سوپاسی خوامان کرد کە رزگارمان بوو بوو.. دە پاڕاینەوە کە خوا رەحممان پێبکات و بە سەلامەتی بگەینەوە لای کەسوکاری خۆمان..

*** ئاگات لەوە هەبوو کەسوکارت لەکوێن..!؟**

- نەوەلآ هەر لە قادر کەرەمەوە ئیتر من ئاگام لێیان نەمابوو.. ئەمزانی بەرەو کەرکوك چون بەلآم دلْنیا نەبووم کە ئایا رزگاریان

بووبوو یاخود گیرابوون.. هەر خۆم ئومێدم لای خۆم دروست کرد کە پشت بەخوا نەگیراون..

*** دوای ئەوەی نوێژتان کرد و پاڕانەوە لە باب شێخ چی ترتان کرد..؟**

- پشویەکمان داو تاوێ بیرمان کردوە چیبکەین و چۆن بڕۆینەوە.. دواجار بڕیارماندا بە پشتیوانی خوا بەرەو گەراجی(نەهزە)بڕۆین و یەکسەر سواری سەیارەی کەرکوك بین..

*** پێشتر (بەغدا)ت بینیبوو..؟**

- ئا، ئا.. بینیبووم..!

*** بەچی ڕۆیشتن بەپێ یاخود بەسەیارە لە باب ئەلشێخەوە بەرەو نەهزە..!؟**

- تەکسیمان گرت.. چووینە گەراج.. زۆر برسیمان بوو بەلام هەردووکمان وامان بەچاك زانی کە نەچینە چێشتخانەو کەباب خانە بۆ ئەوەی بە درەنگ نەکەوین و چونکە(جنسیە)مان پێنەبوو زۆریش ئەترساین.. بەغدایش سامی گران بوو هیچت لە هیچا نەبوایە لێی ئەترسایی.. ئیتر ئێمە ناهەقمان نەبوو کە زۆر ئەترساین.. هەرچەندە جگە لەخوا کەسیتر نەی ئەزانی ئێمە کێین و لە کوێ وە هاتویین.. بەلام خۆمان ئەمانزانی کە ئێمە چەند خەتەرین بەقەدەر ئەوە ئەترساین ،بۆیە هەر لەناو گەراجەکە(لفە)مان کڕی و بردمان وتمان لەناو سەیارەکە ئەیخۆین کە چوین سەیارەکە نەفەری تیانەبوو سوار بوین و کەوتینە(لفە)خواردن..

*** سەیارەکە چیبوو..؟**

- ٢١ نەفەری..

*** لەکەستان پرسی کام سەیارە ئەچێت بۆ کەرکوك.. یاخود خۆتان ئەتانزانی کامانە سەیارەی کەرکوکن..!؟**

- گەراجی(نەهزە) زۆر قەرەبالغ بوو، نازانم خەتی چەند شاری لەسەر بوو بەلام ئەتوت شارە مێرولەیە.. مەگەر تۆپزاوا ئاوا سەیارە بەیەکدا هاتبێ لە دە لاوە خەلك سەر ئەکەوت و خەلك دا ئەبەزی.. کە پرسیارمان کرد کامە سەیارەی کەرکوکە. ئیتر چوین و کابرایەك لە نزیك سەیارەکان راوەستابوو بانگی نەفەری ئەکرد لەو کابرایەمان پرسی کام سەیارە دەرئەچێت، ئەویش سەیارەیەکی ۲۱ نەفەری نیشان داین ئەوەبوو کە سەرکەوتین..

*** ئەی یەکەمجار لە کێتانپرسی کامانە سەیارەی کەرکوکن..!؟**

لەو کابرایەی(لفە)کەمان لێی کڕی..

*** پێی سەیر نەبوو کە ئێوە جلی کوردیتان لەبەر دایە و پرسیاری سەیارەی کەرکوك دەکەن..!؟**

- ئەگەر بەلایەوە سەیریش بوبێت.. ئەو هیچی لەو بارەیەوە نەووت و ئێمەش هەستمان بەهیچ نەکرد..

*** لەناو پاسەکە خۆت و عوزێر لەسەر کورسیەك پێکەوە دانیشتبوون..؟**

- کە سوار بوین ئا، پێکەوە دانیشتین تا هەر یەکی یەك دوو تیکەمان لە لفەکە خوارد..!

*** ئەی دوای ئەوە..!؟**

- لفەکانمان فرێدا و دابەزین و رامان کرد..!

*** بۆ..!؟**

- ناو گەراج(نەهزە) بەردەوام مراقەبەی لەسەر بوو.. پڕی ئینزیبات و ئەمن و پیاوی حکومەت بوو کاتێ سواربوین هەستمان بەهیچ شتێ نەکرد کە چاودێری کرابین، بەلام کە لفەکانمان دەرهێنا و کەوتینە خواردنی، کابرایەك هات پشتی دایە کۆستەرەکەوە و یەك دووجار تەماشای ئێمەی کرد.. کابراکە جلی سەربازی لەبەر بوو سەر

شانی ئەستێرەی پێوە بوو (عوزێر) ووتی ئەو کابرایەت بینیوە.. منیش سەرم هەڵبڕی و تەماشام کرد زۆر ترسام بە عوزێرم ووت چیە ..؟ عوزێر ووتی ئەم زابتە بۆیە هاتۆتە ئێرەوە و سەیرمانی کرد ئەوە ناسیمانێتی ،ویستم قەناعەت بەعوزێر بکەم کە کابرا خۆ غەیبی پێ نیە چۆن ناسیومانێتی.. عوزێر ووتی ئەم کابرایە ئەوەبوو لە(تۆپزاوا) ناوەکانمانی ئەنووسی و بەخوا ئەیناسمەوە ئەوە و دڵنیام شکی خستۆتە سەرمان.. بەخوا هەر کە عوزێر وای ووت من لفەکەم فڕێدا و لە پاسەکە دابەزیم و عوزێر بەدوامەوە ئیتر بێ ئەوەی ئاوڕ بدەمەوە بۆی دەرچووم..

* **راتان ئەکرد..؟**

- نەء رامان نەکرد چونکە ئەگەر رامان بکردایە ئەو خەڵکە هەمووی تەماشامانی ئەکرد و ئەو هەموو ئەمن و عەسکەریە ئەگەوتە سەرمان..بەڵام بەخێرایی بۆی دەرچووین.. ماوەیەك رۆیشتم وا هەستم ئەکرد کە ئێستا لەناکاو لە دواوە ئەکەنە پشت ملمدا، ئەوە بۆکوێ ئەچی.. بۆیە نەم ئەوێرا بەر بکەمە دواوە مەسافەیە باش رۆیشتم و هیچ نەبوو ئەوجا ئاوڕم دایەوە تەماشام کرد(عوزێر)بەدوامەوە نیە.. ئەملا و ئەولا عوزێر نەبوو.. ئیتر بەجارێ زراوم چوو وتم بەخوا دیارە ئەو گیراوە و ئێستا بەدوای مندا ئەگەڕێن (کونە مشکم لێبوە قەیسەری) خۆشم نەم ئەزانی ئەمەوێ چیبکەم هەر ئەڕۆیشتم.. نەم ئەوێرا سواری سەیارە بم.. نەم ئەوێرا راوەستم.. تا خۆر ئاوابوو من هەر لەترسا بەناو ئەو بەغایەیا رێم کردووە..

* **تۆ خۆت ئەو ئەفسەرەت بینی..؟**

- ئەی چۆن نەمبینی شانی دابووە قەت کۆستەرەکەدا..

*** مەبەستم لەوەیە کەبینیت هەستت کرد جاریٚ تر بینیوتە..؟**

- من نەء عوزێر ئەیووت ئەمە ئەو زابتەیە کە لە توٚپزاوا ناومی نووسیوە و تەحقیقی لێم کردووە..

*** توٚ پێت وا نیە هەر لەبەر ئەوەی کە ئەفسەر بووە و ئێوەش خوٚتان ترساون بوٚیە عوزێر بەو شێوەیە شکی کردبیٚ کە ئەفسەرەکەی توٚپزاوایە..؟**

وەڵاهی ئەوە نازانم.. بەڵام ئێمەی توٚقان.. چونکە یەك دووجار وەك ئەوەی چاودێری ئێمە بکات تەماشای ناو کوٚستەرەکەی کرد..

*** ئەی پێت وانیە ئەویش ئەوەی بەلاوە سەیر بوبیٚ کە لەناو سەیارەکە لفە ئەخوٚن..؟**

- بەخوا ئیتر هەرچیەك بوبیٚ ئێمەی ئەوەندە ترسان لە شوێنی گوللەبارانکردنەکە و لەو کاتەی وا تەقەشیان لێمان ئەکرد ئەوەندە نەترساوین..

*** بوٚ پێت وابوو ئەگەر بگیرانایا سزای لەوە خراپتر ئەدران کە ئێوە بەرێکەوت رزگارتان بووبوو..؟**

- ئاخر ئەوە جیابوو ئێمە کە لە توٚپزاوا بەو شێوەیە بردمانیان ئەمانووت بەرە و مردن ئەچین.. ئومێدمان نەمابوو کە رزگارمان بێت بوٚیە کەمتر ئەترساین لەوەی کە ئەمجارە لەو وەزعەوە گەیشتبووینە بەغدا و بە ئومێدی ئەوە بووین بگەڕێینەوە و نەجاتمان بووبیٚ بوٚیە لەم کاتەدا یەك عەسکەر بەقەدەر هەموو ئەو سەربازانەی دیار چاڵەکان سامی گرانبوو..

*** ئیتر عوزێرت نەبینیەوە..؟**

- نەمبینیەوە ووتم سەد لەسەد ئەو گیراوە..

*** ئەی دوای ئەوە چیت کرد..؟**

- شـەوم بەسـەرداهات.. ئـێ خوایـە چـیبکەم تـازە نـاوێرم بـەنزیك گەراجی(نەهزە)دا بڕۆم هەموو دنیام لەسەر تاپۆ بکەی.. بڕیارم دا کە شەو لەبەغدا بمێنمەوە و بەیانی کە رۆژ بۆوە خوا گەورەیە بیرێکی لێ ئەکەمەوە چیبکەم.. بەخوا بەو شەوە سێ ئوتێلم کـرد لەبـەر ئـەوەی (جنسیە)م پێ نەبوو جێمیان نەکردەوە..ئیتر بە جارێ ئەوەنـدەی تـر ترسـام و ئـەمووت ئەمشـەو ئـەمگرن روو لـەکوێ بکـەم.. ناچـار رووەمکردەوە(باب ئەلشێخ) شوێنی شێخ عەبدولقادری گـەیلانی پـەنام بـۆ ئـەو بـردەوە.. چـونکە درەنـگ بـوو دەرگاکـانی داخرابـوو منـیش ئەترسـام نـەم ئـەوێرا زۆر لێـی بـدەم و بیکـەم بـە زرمـەزرم ئـەمزانی مجێورەکان لە ژوورەوەن بەڵام گوێیان لەدەرگا نـەبوو ئەگـەر گوێشـیان لێ بوبێ نەیان کردەوە.. هەیوانێکی هەبوو لەدیو دەشتەوە شەو لەوێدا خەوتم زۆر سەرمام بوو هەڵدەلەرزیم کە ئەگەر هیلاکی و ماندویـەتی و شەو نخونی ئەو چەند شەوەی پێشوو نەبوایا بەو سەرمایە خـەوم لێ نەدەکەوت بەڵام هیلاکیەکە وایکرد کە بخەوم.. نیوەشـەو لـە مرەمـڕی سەگ بەخەبەر بوومـەوە سـەگ خـەریك بـوو بمخـوات بـۆنی خوێنیـان کردبوو چونکە من هەرچـەندە جلـەکانم لـەخوێن پـاکردبۆوە بـەڵام جلەکانی ژێرەوە و گیانیشم خوێنی پێوەبـوو.. سـەگەکان بـەبۆنی ئـەو خوێنـەدا هـاتبوون.. ئـیتر بـەو تـرس و هیلاکـی و ماندوێتیـەوە چـاوم ئەچوە خەو و خەبەرم ئەبۆوە.. زۆریش ئەترسام کە مەفرەزە و شـتی حکومـەت بمگـرن و بڵـێن چـی ئەکـەی لێـرە.. خـۆم حـازر کردبـوو کـە ئەگـەر پیـاوی حکومـەت پـەیابوو خـۆم بکـەم بەشێـت بـۆ ئـەوەی شـك نەخەنەسەرم.. بەو شێوەیە ئەو شەوەم رۆژ کردەوە..

*** ئەی کە رۆژ بووە وە چیت کرد.. شەو بیرت لـەوە کـردەوە کـە سـبەی چیبکەی بۆ ئەوەی بگەڕێیتەوە..؟**

شەو تەنها فریای ئەوە دەکەوتم کە خەفەت لەو شەوەم بخۆم.. بەلام کە بەیانی خوا رۆژی کردەوە بڕیارم دا کە بچم بۆ (دەلاك) سەر و ریشم چاك بکەم ئەوجا بیر لەوە بکەمەوە چۆن بگەڕێمەوە.. چوم سەر و ریشم تاشی و چوم بۆ(عەلاوی) گەراجی لۆرییە ووتم بەسەیارەی بار و حەیوانات ئەڕۆم جێگای شك نیە و رەنگە بەو هۆیەوە بتوانم لە سەیتەرەکان دەربازبم.. کاتێ چوم هەندێ کوردم بینی خەلکی سلێمانی و هەولێر بوون قسەم لەگەلیان کرد و هەمان ئەو چیرۆکەی رێکم خستبوو بۆ ئەوانیشم گێڕایەوە کە لەبەر ئەوەی جنسیەم پێ نیە دەمەوێ لەگەلْ بارێکدا بچمەوە کەرکوك، دیاربوو ئەوانیش ئەترسان نەیانوێرا وەعدم پێ بدەن وتیان لێرە بە نۆرە دەرئەچین نۆرەی ئێمە نیە ئاماژەیان بۆ کابرایەك کرد وتیان نۆرەی ئەوە کە چووم بۆلای وتی ئەگەر بارێك بێت نۆرەی منە و لەگەلْ خۆم دەتبەم.. کابراکە خەلکی هەولێر بوو پیاویکی باش دیاربوو.. زۆر بەزەیم بەخۆمدا ئەهاتەوە وام ئەزانی ئێستا ئەوان لەخۆم دلسۆزانە تر ئەیانەوێ رزگارم بکەن لەبەر ئەوەی کوردم.. بەلام ئەوان خەریکی کەسابەتی خۆیان بوون گوێیان لەوە نەبوو کوردێك جنسیەی پێ نیە و ترسی گرتنی لەسەرە، بەلام هە رخۆیشم دلی خۆمم ئەدایەوە کە ئەمووت ناهەقیان نیە و رۆژە رەش بوو کێ ئەیوێرا پێیەکی چەوت دابنێ.. ئەمووت ئەلێی ئێستا بۆیان بگێڕمەوە چیم بەسەر هاتووە، بەلام نەم ئەوێرا.. ئیتر لەپەنای دیوارێکدا لەناو گۆڕەپانی سەیارەی بارەکان چاوەڕێی باریك بووم بێت و تا ئەو کابرا هەولێریە هەلم بگرێت و وەك ئەوەی کە خاوەنی سەیارەکە بم و رزقم لەسەر ئەو بارەبێ هەر ئەپاڕامەوە خوایە زوو بارێك بێت. خوا کردی نزیك عەسەر بوو بارێك پەیابوو کابرایەك بوو داری هەبوو بۆ

هەولێر چوین بارمان کردمنیش کەوتمە بارکردنی داری نەجاڕی بوو لۆریەکەش (ئیسکانی بوو) دارەکەمان بارکرد کابرای خاوەن دار خۆی لەگەڵمان نەهات دیاربوو سایەق لۆریەکە شوێنی داگرتنەکەی دەزانی لە هەولێر بۆیە منی لەگەڵ خۆی هەلگرت و کەوتینە رێ، من بۆ کەرکوك‌و ئەویش بۆ هەولێر.. بە درێژایی رێگای نێوان(بەغداد-کەرکوك) بەر لەوەی بگەینە هەر سەیتەرەیەك کابرا شارەزابوو ئەوەستا منی ئەکردە ناو دواوەی لۆریەکە و خۆی بە تەنها لە پێشەوە بوو تا شك نەکەن.. چونکە ئەویش ئەترسا کەمن لە سەیارەکەیدا بگیرێم ئەویش حسابی منی بۆ دەکرێت.. بەو شێوەیە رێگای دووری نێوان بەغداد -کەرکوکمان بڕی و لە رێگە پێم ووت کە ئەگەر بگەینە (شۆریجە)ماڵی خزمی لێیە.. لە رێگە زۆر قسەمان کرد هەر چەندە من هەر نەچوومە ژێر باری قسەیەکی تر و هەر ئەو چیرۆکەی رێکم خستبوو هەر ئەوەم دەگێڕایەوە..بەلاّم دیاربوو کابرای سایەق شکی کردبوو چونکە کاتێ شەو گەیشتینە کەرکوك و چوینە شۆڕجە کاتێ چاوم بەو جادەیە کەوت کە چوار شەو لەوەوپێش لەگەڵ ئەو هەموو خەلکەدا پێیدا تێپەڕین ئیتر بێ ئەوەی بتوانم خۆم راگرم لەرزم لێ نیشت ویەکە یەکەی ئەو سەیارانەم دەهاتەوە بەرچاو و براکانم و ساڵح ئامۆزام و هەموو ئەو ژن و مناڵەی سجن بوون.. ئیتر بەو هۆیەوە رێگەکەم لێ تێکچوو کابرای شۆفێر لە شۆرجە لێمی پرسی ئەمە شۆرجەیەو لەکوێ دائەبەزی.. وتم من تەنها لەوێوە سەردەردەکەم بچین لای بەنزینخانەکەوە بێینەوە ،کابرای شۆفێر ماڵی ئاوابێ رۆیشت و سوڕایەوە دیاربوو ئەیزانی کەمن وەزعەکەم خراپە لەشوێنێك نزیك(لەتیف ئاوا) پێم ووت لێرە راوەستە ئیتر خۆم شارەزام.. کاتێ راوەستا ویستم پارەی بدەمێ کابرا توند دەستمی گرت

و رازی نەبوو پارەی بدەمێ ووتی من پارەت ئەدەمێ چونکە ئەزانم تۆ توشی کارەساتێ بویتە.. وتی منیش کوردم ئامادەم بە هەموو شێوەیەك هاوکاریت بکەم بەس پێم بڵێ چی کارەساتێکت بەسەر هاتووە.. منیش هەر لەناو سەیارەکە هەرچیم بەسەر هاتبوو ئەوەی بینیبووم هەموویم بۆی گێڕایەوە و پێم گووت هەرچی خزم و کەس و کارت هەیە ئاگاداریان بکەرەوە کە تەسلیم نەبن و ئەوەی بگیرێت هەمووی دەکوژرێ..

ماڵی خوشکێکم لە لەتیف ئاوابوو چووم لە دەرگام دا ئەوان خەوتبوون خەبەریانم کردەوە هەموویان حەپەسان بەم نیوە شەوە لەکوێوە هاتووم و چۆن لەسجن رزگارم بووە..من پرسیاری ماڵ و منالْ و ئەوان پرسیاری براکانی ترمیان ئەکرد.. پێیانم ووت عافواتە و بەیانی هەموویان دێنەوە..

*** شەو لە ماڵی خوشکەکەت خەوت لێکەوت.. کە لە رووی دەرونیەوە جارێکی تر تێکەڵ بە بنەماڵەکەت بویتەوە بێگومان براکانت بیردەکەوێتەوە..!؟**

- لەبەر ئەوە زۆر هیلاك و ماندووبووم زۆر کفت بووم تا بەیانی خەوتم.

*** ئەی کە رۆژ بۆوە تۆ پێت وتبوون عافواتە و بەیانی براکانت دێنەوە.. چیت کرد.. یا ئەوان تاکەی چاوەڕێی گەڕانەوەی براکانت بوون!؟**

- وەلاّ ئەوان تا سەدام روخا هەر بەتەمابوون بێنەوە، بەلاّم هەر ئەو رۆژە کاتێ ئاویان بۆ گەرم کردم و خۆم شۆری.. جلەکانی ژێرەوەم خوێنی پێوەبوو. ئەوان زۆر ترسان و کەوتنە پرسیار کردن.. ناچار وتم کە بردومانیانە بۆ سجن سەیارەمان وەرگەڕاوە.. بەلاّم گەڕانەوەکەم بۆمن قورس بوو مایەی مەترسی بوو چونکە کە

بلاوبێتەوە من گەڕاومەتەوە هەرچی کەس و کاری ئەنفال هەیە رووی
/ پرسیار ئەکەنە من کەس و کارەکەیان چی بەسەر هاتووە بەمەدا
ئاشکرا ئەبم و حکومەت ئەمگرێتەوە کە چۆن گەڕاومەتەوە..
ئەشمزانی گەر لەماڵ ئەو خوشکەم بمێنم ئەوە هەموو دوو رۆژی ترەو
هەموو خەڵکی ناوچەکە ئەزانن من لەوێم بۆیە لەترسا ناچار بووم کە
ماڵی ئەوان جێبهێڵم و چومە ماڵێکی تر(کاك عەبدولا برای کاك
عەبدولکەریم حەسەن) لە باڵەخانەیەکدا شوێنیان بۆ چاکردم و
شاردمیانەوە(٢٠)رۆژ لەو باڵەخانەیە بووم..

*** هەر لە کەرکوك..؟**

- ئا..ئا.. هەر لە کەرکوك..

*** ئەی دوای ئەو بیست رۆژە چیت کرد..؟**

- دوای ئەوە چومە ماڵی کوڕێکی خزممان لە(لەیلان) ئامر سریەی جاش بوو دوو سێ رۆژ لەوێ مامەوە و دوای لەگەڵ مەفرەزەیەك جاشدا بردمیانەوە بۆ چەمچەماڵ و دوای بۆ شۆڕش و ئیتر لە خانوویەکدا لەگەڵ مناڵەکاندا یەکمان گرتەوە..

*** کەس و کارە نزیکەکانی خۆت کە دەربارەی برا و کەسەکانی خۆتان پرسیاریان دەکرد چۆن وەڵامت ئەدانەوە..؟**

- من چۆن لە گۆڕە بەکۆمەڵەکانەوە تا کەرکوك یەك چیرۆکم رێك خستبوو کە سایەقی سەیارەی ئیشغاڵ بووم و سەیارەمان وەرگەڕاوە.. کاتێ گەڕامەوە ماڵ و دواتریش هەر ئەوە قسەم بوو کەمن پێش ئەوەی بگەینە تۆپزاوا من لە سەیارەکان دابەزیوم و ئیتر هەواڵی کەس نازانم..

*** بڕوایان پێت ئەکرد..!؟**

- لەوە ئەچوو بڕوایان کردبێ چونکە هەموو ئەو سەفەرەی من چوار شەو و پێنج رۆژی پێچوو.. زۆری نەخایاندبوو.. بۆیە بڕوایان ئەکرد و بەوەش وا ئەزانم کە بڕوایان کردبوو چونکە ئیتر هەواڵی تریان ناپرسی..

*** ئەی ترسی ئەوەت نەبوو کە (عوزێر) راستیەکان بگێڕێتەوە..!؟**

- وەك ترس بەردەوام ئەترسام و هەموورۆژێ ئەمووت ئێستا دێن و ئەمگرن هەر بۆیە شوێنی خۆ حەشاردانم دروست کردبوو بە زۆری لەو شوێنەدا ئەژیام..

*** لای خێزانەکەی خۆت و مناڵەکانت راستیەکەت بەوانیش نەوت..؟**

- خوا ئاگادارە بۆ ژنەکەشم نەگێڕابۆوە تا ئەوساڵەی چوین بۆ ئەمریکا لە تورکیا بۆیانم باس کرد..

*** هۆی چیبوو کە نەتگێڕایەوە..؟**

- ئەترسام..

*** لەماڵ و منالەکەی خۆشت ئەترسای ..!؟**

- ئا، لەوە ئەترسام دوای لەزمانی ئەمانیشەوە بگاتە دەم کەسێکی تر و بلاوبێتەوە.. چونکە من براکانم و کۆمەڵێ خزم و کەسم بەر ئەو شالاوە کەوتن کەسوکاری هەمویان و خوشکەکانم و برازاکانم هەمیشە بە ئومێدی ئەوەبوون کە رۆژێك ئەوانیش وەك من چۆن هاتمەوە لەناکا و پەیائەبن ئێ ئەگەر من تەنها لای ژنەکەی خۆم بموتایە دڵنیام هەرچەندێ بیویستایە نەیگێڕێتەوە بەلام پێوەی دیار ئەبوو کە ئومێدی ئەوەنەبێ بگەڕێنەوە..

*** تۆ پێشتر ووشەی ئەنفالت بیستبوو.. بەر لەوەی خۆت ئەنفال بکرێی..؟**

- ئێ کوا ئەنفال پێشتر روویدابوو..!؟

*** مەبەستم لەووشەی ئەنفالە ..!؟**

نەء..

*** ئەی کەی بۆ یەکەمجار بەر گوێت کەوت..؟**

- ئەوکاتەی خەڵك گیرا و گوندەکانیان سوتان نەمان ئەزانی پێی ئەڵێن چی.. بەڵام کاتێ من گەڕامەوە ئەیانووت ئێوە ئەنفالن..

*** کاتێ گەڕایتەوە ناو ماڵ و منداڵ و کەسوکارەکەت و بەتایبەتی کە لە شۆڕش بوی کە مەڵبەندی سەرەکی کەس وکاری ئەنفال بووی و ئەتزانی ئەو خەڵکە هەمیشە چاو لەڕێی هەواڵێکن کە بۆیان بێت و هەواڵی کەسوکارەکانیان بێنێ.. هیچ کات بیرت لەوە نەکردەوە کە گەر بەشێوەیەکی راستەوخۆ و ئاشکراش نەبێ بە نهێنی ئەوە بڵاوبکەیتەوە کە ئەنفالەکان نەماون بۆ ئەوەی ئەوخەڵکە بەردەوام ئەو ئازارە نەچێژن..؟**

- نەوەڵا، نەم ئەویست لە زمانی منەوە بیبیستن کە ئەنفالەکان نەماون..

*** بۆ..؟**

- ئەی ناڵێم لەلایەك ئەترسام لەلایەکی تریشەوە پێم گوناه بوو ئەو خەڵکە هیوابڕاوبکەم..

*** تاکەی ئامادە نەبووی ئەو راستیە بگێڕیتەوە..؟**

- وەڵا لای خۆم وام دانابوو هەتا سەدام ئەروخێ و هەمووشتێ بۆ خەڵك دەرئەکەوێت تا ئەوکاتە نەیدرکێنم..

*** ئەی هەست ناکەی گوناهباری بەوەی کە حەقیقەتێکت شاردبۆوە کەمیللەتەکەت پێویستی بە ئاشکرابوونی هەبوو..؟**

بۆ گوناهبارم، خۆمن ئەنفالم نەکردووە..

*** لەدوای ئەوەی گەڕایتەوە شۆڕش تا راپەڕین کە ئیتر ترسی سەدام و رژێمەکەی لەسەرت لاچوو لەو دوو ساڵەدا هیچ جارێکی تر مەترسی گرتنت نەکەوتەوە سەر ..!؟**

- له شۆڕش..!؟

*** بەڵێ لە شۆڕش و لە هەر شوێنێ ژیاوی خەریك نەبووە دەستگیرت بکەنەوە..!؟**

- هیچ جارێك نەبووە بۆ گرتنی من بێن بە تایبەت، بەلاّم زۆرجار جەیش هاتووە و تەفتیشی گەڕەکەکەی کردووە بەلاّم من حەوشەیەکی چۆڵ لە تەنیشت مالّمانەوە بوو لەو حەوشە چۆڵەدا شوێنێکم بۆ خۆشاردنەوە دروستکردبوو جێی شك نەبوو هەر جارێ ترسی حەملە و تەفتیشمان بوایە ئەچومە ئەو شوێنەوە..

*** کە حەوشەی چۆڵ بوو چۆن شوێنێکت دروستکردبوو وا جێگای شك نەبوو..!؟**

- لەسەر زەویەکە چاڵێکم دروستکردبوو وەك ژێر زەوی و یەك گلاّبە بلۆکمان هەڵڕشتبووە سەریدا ولەناو بلۆکەکانەوە ڕێگای چونە خوارەوەم دروستکردبوو کەس هەستی بەوە نەدەکرد کە لەژێر ئەو گلاّبە بلۆکەدا(حەشارگە) هەبێ..

*** هیچ خزم و هاوسێیەکت هەستیان بەوە نەکرد کە شوێنی خۆشاردنەوەت هەیە..؟**

- نەخێر کەس نەیزانی

*** ئەی هەستت بەوە نەکرد کە کەسێك بەو حاڵەی زانیبێ کە تۆ لە بیابانەوە گەڕاویتەتەوە و زانیاریت دەربارەی چارەنووسی ئەنفالەکان لایە..**

مەگەر خوا کەس نەیزانیوە..

*** ئەی عوزێر..؟**

- با عوزێر ئەیزانی بەلاّم لەبەغدا کە لە(عوزێر)لە یەکتر جیابوینەوە ئیتر من نەمزانی عوزێر چی بەسەر هات و قەناعەتیشم وابوو کە گیرابێ..

*** هیچ کات پرسیارت نەکرد لە ناسیاوێ خزمێ کەسێك کە بزانێ عوزێر چی بەسەر هاتووە..؟**

وەلاهی راستیت دەوێ زۆر حەزم ئەکرد بزانم چی لێهات بەلام نەم ئەوێرا و لەکەسم نەپرسی..

*** ئەی ئەو شۆفێرەی لە بەغداوە تا کەرکوك هێناتی ترسی ئەوەت نەبوو ئەو ئاشکرات بکات کە حەقیقەتەکەت هەمووی بۆ باس کردبوو.. خوا نەخواستە مەبەستم ئەوە نیە بڵێم پیاوێکی خراپ بووە لەو رووەوە دەیڵێم کە تۆ راتسپاردبوو کەس و کاری و تا پێی دەکرێت خەڵك ئاگادار بکاتەوە کە تەسلیم نەبن چونکە دەکوژرێن..؟**

- نەء.. ترسی ئەوەم نەبوو چونکە راستە من هەمووشتێکم بۆ گێڕایەوە بەلام نەمووت خەلکی کوێم ئەو نەی ئەزانی من لەکوێ دائەنیشم تا بچێ بلاوی بکاتەوەبلێ کابرایەك لە چەمچەماڵ لە شۆرشەو ئەو بەچاوی خۆی بینیویەتی ئەنفالەکان کوژراون..ئەگەر بلاویشی کردبێتەوە هەر ئەوەی گێڕاوەتەوە کە کابرایەکی لە بەغداوە هێناوەتەوە بۆ کەرکوك بۆ گەرەکی شۆرجە و وای ووتوە..

*** باشە کە دوای یەکەم شەو لەماڵی خوشکەکەت شوێنەکەت گۆڕی خۆ لەترسی ئەوە نەبوو کە بۆ شۆفێرەکەت گێڕابۆوە..؟**

نەبەخوا لەبەر ئەوە نەبوو.. من قەت پیاوەتی ئەو کابرایەم بیر ناچێتەوە ئەو نەبوایا بەحەیاتی ناگەیشتمەوە کەرکوك.. من یەك غەدرم کرد لێم نەپرسی ناوی چیبوو، بەلام ئێستا زۆر حەز ئەکەم بیناسمەوە تەمەننا ئەکەم بەهۆی ئەم مقابەلەیەوە کابرا بدۆزمەوە..

*** کاتێ راپەڕین کرا و دەسەڵاتی سەدام و بەعس لەسەر بەشێکی کوردستان نەما کە شوێنی ژیانی تۆ(شۆڕش) ناوچەیەکی ئازاد بوو بۆچی دوای راپەڕین بە کەس و کاری ئەنفالەکانت نەووت، یاخود بۆ بە کەس و کارەنزیکەکەی خۆتت نەوت کە کەسیان نەماون..!؟**

- بەخوا ئیتر نەمووت..

*** ئاخر بۆ خۆ ئەمجا ترسی سەدامت نەمابوو..؟**

- کورە چۆن ترسی سەدامم نەمابوو بەخوا تا ئەو رۆژەی روخا ترسی بۆ سەر هەموو کوردستان هەبوو نەك من..

*** کەواتە بە پلەی یەکەم لەترسا نەتگێڕاوەتەوە..!؟**

- لەترسا و لەترسی خەڵکیش..

*** خەڵك بۆ..!؟**

- مەسئولیەتەکەی قورس بوو تۆ بە هەزاران کەس بڵێیچاوەڕێ مەبە کوڕ و براو کەسەکانتان نەماون..من لام قورس بوو کاکە ژن وابوو پێنج هەر کوڕی ئەنفال بوو، خەڵك بوو دوانزە سیانزە سەر خێزانی تیاچوو بوو چۆن بوێرم پێیان بڵێم کەسیان نەماون..

*** دوای گەڕانەوەت لە گۆڕە بەکۆمەڵەکانەوە تا راپەڕین هیچ جارێك شێخ موعتەسەم ئەو موستەشارەی تەسلیمتانی کرد نەتبینی..؟**

- من ئەو ماوەیە هەروەك سجن وابووم کێم بینی تا شێخ موعتەسەم ببینم..

*** ئەی دوای راپەڕین..؟**

هەر نەمبینی..

*** خۆت نەتویست بیبینی یاخوت نەت ئەتوانی بیبینی..!؟**

وەڵاییی نازانم ئەمتوانی یان نا.. بەڵام هیچ بیرم لەوە نەکردەوە کە بیبینم..

*** بۆچی بیرت لیّ نەکردەوە..؟**

- ئاخر بۆ بیری لیّ بکەمەوە..؟

*** هەر لەبەر ئەوەی پێی بڵێی چارەنووسی ئەو خەڵکەی تۆ تەسلیمت کرد بەو دەردە چون کە تۆ بینیت..؟**

- ئیّ من بە ژنەکەی خۆمم نەووتبوو چۆن بەشێخ موعتەسەم بڵێم..!!

*** ئاخر جیاوازی هەبوو.. دەبوو بەشێخ موعتەسەم بڵێی بۆئەوەی بیزانیایا کە ئەو هەموو گەنجە کوردەی دایانە دەستی سوپاوە هەمووی لە گۆڕی بەکۆمەڵدا کوژران..؟**

- بەخوا ئیتر نەمووت..

*** باشە با بێینە سەر ئەوەی چۆن گەیشتنە ئەمریکا..**

- ئەی من یەکەمجار چیم پێت ووت نەموت مراعاتی ئەو وەزعە تایبەتیەی من بکە.. من ئێستا وەك شایەتحاڵ لە ئەمریکا دانراوم بۆ دادگای نێو دەوڵەتی نەموت ئەوانە باس ناکەین کە پەیوەندی بە ئەمریکاو شوێنی ئێستامەوە هەیە..

*** با، منیش لەسەر ئەوانە رازیم و بۆ ئێستا کارمان بەوانە نیە.. بەڵام مەبەستم لەوەبوو چۆن زانرا کە تۆ کەسێکی لە گۆڕە بەکۆمەڵەکانەوە گەڕاوێتەوە و شایەتحاڵی زیندووی بەکۆمەڵ کوشتنی ئەنفالەکانی لە گۆڕی بەکۆمەڵدا..!؟**

- ئەوەیان منیش نازانم..

*** چۆن نازانی ئەی خۆ ئەمریکا غەیبی پیّ نەبوو..!؟**

نا، نا غەیبی پێ نەبوو بەلاَم وەك غەیب وابوو کاتێ نەجنەبیەك هاتوو لە شۆڕش منی بینی سەیرم کرد زۆربەی شتەکان ئەزانێ. من ویستم حاشا لەوە بکەم من فەرەجم بەلاَم نەتووت لەناو دڵ مندایە زۆرشتی ئەزانی..

*** چۆن هات بۆلای تۆ بەڕێکەوت بوو یاخود بەتایبەت بۆلای تۆ هاتبوو..؟**

- ڕێکەوتی چی سۆراغی دنیای کردبوو تا منی دۆزیەوە..

*** ئەی کاتێ هات و پرسیاری ئەوەی کرد تۆ فەرەجی.. نەتپرسی چۆن ئەزانی من فەرەجم..؟**

- با پرسیم و ویستم خۆم بدزمەوە و هیچ قسەی بۆ نەکەم بەلاَم ئەو ووتی کە(عوزێر)قسەی بۆم کردووە و عوزێر ناوی منی دابوو پێی..

*** ئەی کاتێ باسی عوزێری کرد ئیتر رازی بویت قسەیان بۆ بکەی..؟**

- نازانم ئەوان چۆن عوزێریان دۆزیبۆوە و چۆن رازیان کردبوو کە بەسەر هاتەکەیان بۆ بگێڕێتەوە بەلاَم هەمووی بۆیان گێرابۆوە و ئەو باسی ئەوەی بۆ کردبون کە چۆن لە ئۆردوگاکەی نزیك رومادی عوزێر لە پاسێکی ١٨ نەفەریدا بووە و من لەسەر ڕێگاکەیان راوەستاوم و دەستم لە سەیارەکەیان راگرتووە و سواربووم و عوزێر هەر یەکسەر منی ناسیبووەوە و خۆی پێ رانەگیراوە و یەکسەر بانگی منی کردووە بچمە تەنیشتیەوە و دوای باسی ئەوەشی بۆ کردبوون کە چۆن زۆر بەدوای ماڵی خوشکەکەی عوزێردا گەڕاوین لە رومادی و نەماندۆزیوەتەوە و بەسەرهاتەکەی بەغدا و هەمووی بۆیان

باس كردبوو.. ئيتر من چی نەگێڕمەوە بەلاّم پێیانم ووت کە کاتێ بۆتان باس دەکەم جگە لەخۆم و وەرگێڕەکە و یەك کەسێکی ئەوان زیاتر نابێ کەسی تری لێبێ..

*** رازیبوون..؟**

- ئائا.. ئەوان خوا خوایانبوو من قسەیان بۆ بکەم.. بەلاّم رازی نەبووم کە رەسمم بگرن و دەنگیشم تۆمار بکەن..

*** باشە کە دلّنیابووی لەوەی عوزێر هەموو شتی بۆ باس کردبوون ئیتر بۆچی ئەترسای و بۆ بەمەرج بۆیانت گێڕایەوە یان کاتێ زانیت عوزێر هەموو راستیەکانی درکاندووە بۆچی ئیتر بۆ خەلّکت نەگێڕایەوە کە ئیتر چاوەڕێی ئەنفال نەکەن..!؟**

- ئێ خۆ عوزێریش بۆ خەلّکی نەگێرابۆوە. ئەویش لای ئەو ئەجنەبیانە ووتبووی ئەوانیش بە عوزێریان ووتبوو بەهیچ شێوەیەك ئەم قسانە لای کەسی تر ناکەیت و نایگێڕیتەوە و وایشیان بەمن ووت کەنابێ بیدرکێنم تا ئەوان ئەچنەوە ئەمریکا و ئیشی لەسەر دەکەن تا سەدام بدەن بە دادگای نێودەولّەتی ئەوکاتە وەك شایەت ئێمە بانگ دەکەن من خۆم پێشتر چەنێ ئەترسام ئیتر لەدوای ئەو چاوپێکەوتنەوە تا ئەو رۆژەی بردمانیان بۆ ئەمریکا سەد ئەوەندە ئەترسام و هەموو رۆژێ بەتەمای ئەوە نەبووم بگەمە رۆژێکی تر و ئەمووت ئەمکوژن بۆ ئەوەی ئەو شایەتیە نەدەین.

*** لەو دوو نێوانەدا لە مقابەلەکەت تا ئەوکاتەی چون بۆ ئەمریکا، هیچ مەترسیەك کەوتە سەرت..؟**

- لەخوا بەزیادبێ نەء

*** ئەوکاتەی وا نزیك بوونەوە کە ئەڕۆی بۆ ئەمریکا و ئیتر ترسی سەدامت نامێنێ ئەوکاتەش بەخەڵکت نەوت کە ئەنفالەکان نەماون..؟**

- من ئەڵێم لە(١٩٩٨) کاتێ خۆم و ماڵ و منداڵم بەرەو ئەمریکا ئەچووین لە تورکیا لە سەفارەتی ئەمریکا بۆ ئەوەی دڵنیابن کەمن(فەرەج)م پرسیارەکانیان لێم کردەوە و منیش ئەوەی دیبووم نەوێ گێڕامەوە ژن و منداڵەکەم لەوێ لەدەممیان بیست..

*** ئەی دوایی چیان ووت گلەیی ئەوەیان نەکرد بۆچی بۆت نەگێڕاونەتەوە..!؟**

- تا سوار تەیارەش بوین هەر ئەگریان نەولاً حەزیان ئەکرد هەر نەیان بیستایا قابیلە شتێ گەلێ خۆشم بۆیان گێڕاوەتەوە.

*** من بیرم چوو سەرەتا شتێکت لێ بپرسم، وتت کاتێ ویستیان رەمیمان بکەن مەولویەکم قەول دا.. کاتێ هاتیتەوە ئەو بەڵێنەت بردە سەر.. خێرەکەت کرد..؟**

وەزعمان خراپ بوو هەر قەرزاری خوابووم تا دوای ئەوەی گەیشتمە ئەمریکا دوای ئەوە مەولوەکەم کرد..

*** تۆ ئێستا دوای ١٦ ساڵ بەسەر ئەو کارەساتەدا و دوای ئەوەی وا شەش ساڵە لە ئەمریکا دەژیت، تا چەند ئەو رووداوە هەست ئەکەیت لە زاکیرەتدا بە زیندویەتی ماوەتەوە و ئازاری پێوە ئەچێژی..؟**

چەند رۆژە من ئەم شتانەی بۆت ئەگێڕمەوە، بەردەوام لەمێشکمدایە و قەتیش لەبیرم ناچنەوە.. من ئێستا هەر بەلاشە لە ئەمریکام بەخوا بەشەو رۆژ روحم لەم ولاٌتەیە و

وەك شـــريتی ڤـــديۆ ئـــەو بەســـەرهاتەی بەســـەرمدا هـــات بـــە بەرچاومەوە دێت ودەچێت..

ئێستاش ئەو هەموو لاشەیە وا لەبەر چاومن کە سەربازەکان بـــە پۆســـتاڵەوە بەســـەریدا ئەڕۆیشـــتن و قرچـــەی ئێســـکی پەراسوییان ئـــەهات لـــەژێر پێـــی جـــەلادەکان دا ئێستاش دیمـەنی ئەو دوو کوڕە گەنجەم لەبەر چاوە کە خـەڵکی(قیرچـە)بـوون و بـە بەرچـاومەوە گیانیـان دەرچـوو بەقـەدەر براکـانم ئازاریـان هەیـە لام کـە نـازانم براکـانم چـۆن و لـەکوێ گوللـەبارانکران و کرانە ژێر خۆڵەوە..

*** گـەر بپرسـم ئێسـتا تـۆ پێناسـەت بـۆ ئـەنفال چـییە.. ؟ وەك گەورەترین قوربانی ئەنفال..!؟**

- ئـــەنفال پێناســـە نـــاکرێ.. نـــاتوانرێ بگێڕدرێتـــەوە.. نانووسرێتەوە.. بەزۆر روح کێشانی هەزاران کەسـە بـێ ئـەوەی خوا بڕیاری مەرگیانی دابێ.. ئەنفالیان بە زۆر مران.

*** حـەز ئەکـەی ئـەو کارەسـاتەی بەسـەر تـۆدا هـات بەسـەر دارودەستەکەی سەدام دا بێتەوە..!؟**

- نا نا نا.. قەت دوعای وا مەکەن.. ئەوەی بەسەر کوردا هات بەسەر کەسدا نەهاتووە و یـاخوا بەسـەر کەسـی تـردا نەیـەت.. بەڵام حەز ئەکەم ئەوانەی وایان لـە ئێمـە کـرد دایـان بنـێین و ئـەم بەســـەر هاتانـــەیان بـــۆ بگێڕینـــەوە و دوای لێیـــان بپرســـن بۆچی واتان کرد..

*** ئەی دوای ئەوە ئێستا ترست نەماوە حـەز ئەکـەی ئـەم بەسـەر هاتەت خەڵك بیزانێ..؟**

ئەرەوەلا ئەگەر لەبەر ئەو حاڵەتەی ئەمریکا نەبوایا حەزم ئەکرد لە تەلەفزیۆنەوە هەمووی بۆ خەڵك بگێڕمەوە..

*** بەڵێنم پێ ئەدەی بۆ کەی موقابەلەیەکی تەلەفزیۆنیت بکەم..؟**

من وەعدم پێتدا ئەچمەوە پێیان ئەڵێم و ئەم داوایەی تۆ ئەخەمە پێش چاوی ئەو دەزگایەی لەمن بەرپرسە گەر رازی بوون دڵنیابە تەنها لەبەر خاتری ئەو مقابەلەیە دێمەوە..

*** وا گەیشتینە کۆتایی من زۆربەی ئەوشتانەی ویستم لەم دیدارەدا بەدەستم هێنا و بلاویشی ئەکەمەوە.. بۆ ئەمەیان چۆن چارەسەری ئەکەی..!؟**

- ئەی لەسەر چی رێکەوتین نەموت ئەبێ بلێی لەساڵی (١٩٩٢) ئەم مقابەلەیەم کردووە..

*** گەر ئێستا داوات لێبەکەم لە زمانی تۆوە چارەنووسی ئەنفالەکان رابگەێنی.. چیم وەلام ئەدەیتەوە..؟**

کەسیان نەماون، هەموویان کراون بەژێر خۆڵەوە و ئەبێ ئیتر بەدوای ئێسك و پروسکەکانیاندا بگەرێین.

*** پێت وایە دەتوانین هەموویان بدۆزینەوە..؟**

- دەبێ هەموویان بدۆزینەوە..

*** بەچ شێوازێك..؟**

- سەرەتا ئەوانە بدۆزینەوە کە زانیاریان دەربارەی هەیە..

*** مەبەستت لە گۆڕەکانە..؟**

- نەء.. مەبەستم لەوانەیە وا زانیاریان دەربارەی گۆڕەکان هەیە..

*** بۆ نمونە وەك کێ..؟**

وەك ئێمە.. من ئامادەم كەی بڕیار درا كە بیانهێننەوە بێم و بچین بۆ ئەو شوێنەی كە گوللەبارانكردنەكەی تیا ئەنجامدرا.

*** ڕێ دەبەیتەوە سەری..؟**

- بەڵێ..

*** جگە لە ئێوە دەتوانین سوود لە زانیاری كێی تر وەرگرین..؟**

ئێ خۆ سەدام نەماوە ئەتوانین ئەوانەش بدۆزینەوە كە خۆیان خەڵكەكەیان كوشتووە، داپۆشیوە و بینیویانە..!!

*** گەر ئەوانەمان دەست نەكەوت..!؟**

دەبێ كورد هەموو خاكی عێراق ژێرەو ژووركات ئەوجا بەجل و بەرگ و جامانە و پشتوێن و جلی ژنەكاندا ئێسك و پروسكەكان دەناسینەوە..

*** پێت باشە دوای دۆزینەوەی گۆڕە بەكۆمەڵەكان چی لەو ئێسك و پروسكە بكرێت..؟**

خۆ قابیلە ماڵ بەماڵ دابەش ناكرێ دەبێ لەیەك شوێنێ هەموویان بەجوانی بنێژرێن و جل و جۆرەكانیان وەك مۆزەخانە هەر لای گۆڕەكانیان دابنرێ..

*** لە هەموو كوردستاندا چی شوێنێك بە گونجاوترین شوێن دەزانی بۆ ئەو(مۆنۆمێنتە)..؟**

تۆپزاوا..

*** بۆ..؟**

لەبەر ئەوەی ئەنفالی هەموو كوردستان برایە تۆپزاوا و لەوێوە لەیەكتری جیا كراینەوە و دابەشكران.. بۆیە هەقە

لەهەموو شوێنێکەوە ئێسکەکانیش بهێنرێتەوە و لە تۆپزاوا کۆبکرێنەوە..

*** جارێ سوپاس تا دیدارە تەلەفزیۆنیەکە..!**

بە سەرچاو ئینشائەڵا ئەوە ئەبێ..



تێبینی : ئـەم دیـدارە لـە نـاوخۆی کوردسـتـانـدا بـە(٨) بـەش لەرۆژنامـەی (هەواڵ)و لەهەردوو سایتی (Kurdistannet.org)و (Kirkukcenter.com)دا بلاوکراوەتەوە.

## بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

| | |
|---|---|
| تەمو دوکەڵ | ١٩٩١ |
| کەرنەڤاڵی مەرگ | ١٩٩٢ |
| مارشی نەبەزین | ١٩٩٣ چاپی یەکەم |
| | ١٩٩٧ چاپی دووەم |
| سەید جەوهەر جەوهەر بو بۆ کوردستان | ١٩٩٩ |
| کۆچ و کۆچپێکردن هۆکارو بنەماکانی | ٢٠٠٠ چاپی یەکەم |
| | ٢٠٠١ چاپی دووەم |
| شایە تحاڵەکانی ئەنفال ( بەرگی یەکەم ) | ١٨/شوباتی ٢٠٠٢ |
| شایە تحاڵەکانی ئەنفال ( بەرگی دووەم ) | ٦/ئەیلولی ٢٠٠٢ |
| شایە تحاڵەکانی ئەنفال ( بەرگی سێیەم ) | ١٨/شوباتی ٢٠٠٣ |
| گەڕانەوە بۆ کەرکوك | ئازاری ٢٠٠٤ |
| لەتۆپخانەو بۆ عەرعەر | ئازاری ٢٠٠٤ |
| لە ئوم ڕێعانەوە بۆ تۆپزاوا | ئازاری ٢٠٠٤ |

## سوپاس بۆ:

* دەزگای هەواڵ بۆ راگەیاندن و رۆژنامەوانی.

* هیدایەت رەحیم توانیم بەهۆی ئەوەوە بگەمە خزمەتی فەرەج

* شوکر کوڕی فەرەج کە شوێنی دیدارەکەی بۆ رەخساندین

